

زنجیرەی داستانی پێغەمبەران



# ژیانی ئادەم

(عليه السلام)




نووسینی
هێمن بهاء الدين قەرەداغی
دانا عثمان حسن

- چاپی دووەم -



زنجیره داستانی پێغەمبەران

# ژیانی ئادەم

﴿ علیه السلام ﴾

نووسینی

هێمن بهاءالدین قەرەداغی
دانا عثمان حسن

١٤١٩ك چاپی یەکەم ١٩٩٨ز



بسم الله الرحمن الرحيم



إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، أشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أنه محمدا عبده ورسوله.

﴿يا أيها الذين آمنوا اتقوا الله حق تقاته ولا تموتن إلا وأنتم مسلمون﴾.

﴿يا أيها الناس اتقوا ربكم الذي خلقكم من نفس واحدة، وخلق منها زوجها وبث منهما رجالا كثيرا ونساءا واتقوا الله الذي تسائلون به والأرحام إن الله كان عليكم رقيبا﴾.

﴿يا أيها الذين آمنوا اتقوا الله وقولوا قولا سديدا يصلح لكم أعمالكم ويغفر لكم ذنوبكم ومن يطع الله ورسوله فقد فاز فوزا عظيما﴾.

أما بعد:

فإن أصدق الحديث كتاب الله وخير الهدي هدي محمد (ﷺ) وشر الأمور محدثاتها، وكل محدثه بدعة، وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار.

# ﴿لقد كان في قصصهم عبرة لأولى الألباب﴾ ( يوسف : ١١١ )

ناوی سورەت و ژمارەی ئەو ئایەتانەی کە ناوی ئادەمی تێدا هاتووە :

| ناوی سورەت | ژمارە ئایەت |
|---|---|
| البقرة | ٣١ ، ٣٣ ، ٣٤ ، ٣٥ ، ٣٧ |
| آل عمران | ٣٣ ، ٥٩ |
| المائدة | ٢٧ |
| الأعراف | ١١ ، ١٩ ، ٢٦ ، ٢٧، ٣١ ، ٣٥ ، ١٧٢ |
| الإسـراء | ٦ ، ٧٠ |
| الكهف | ٥٠ |
| مريـم | ٥٨ |
| طـه | ١١٥ ، ١١٦ ، ١١٧ ، ١٢٠ ، ١٢١ |
| يـس | ٦٠ |

# ناوەڕۆک

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|

(تەواو بوو)

# پێشەکی

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على رسول الله خاتم الانبياء والمرسلين وعلى آله الطيبين الطاهرين الى يوم الدين، وبعد:

خوێنەری بەڕێزو خۆشەویست (السلام علیکم) بەڕێزان بەپێویستمان زانی کەوا لەم کاتەدا بۆ مەبەستی دەوڵەمەند کردنی کتێبخانەی کوردی بچینە خزمەت زنجیرە چیرۆکەکانی قورئان و لەناو باخچەی ئەو چیرۆکە بۆن خۆش و پڕ ئامۆژگاریانەدا گوڵێکی گەش لێ بکەینەوە و پێشکەش بەئێوەی بەڕێزی بکەین ، بۆ مەبەستی بۆن کردن و سود لێ وەرگرتنی تا هەردەم واهەست بکەن کە وانیگای خوایی نەپچڕاوەو بەردەوام لەئامۆژگاری کردنماندایە و هەروەها بۆ مەبەستی وەرگرتنی سودو ئامۆژگاری و خورەوشتی بەرزیان و خۆ جوان کردن پێیان .

بێ گومان چیرۆك و بەسەرهاتی ئادەم یەکێکە لەو چیرۆکە گرنگانەی کە لە چەند شوێنێکی جیاوازدا خوای گەورە باسی لێوە کردوە بۆ مەبەستی ئەوەی کە ئێمە ی باوەڕدار وشوێن کەو تەی ئەو زنجیرە پێغەمبەران(علیهم الصلاة والسلام) کاروانی ژیانی خۆمان لەسەر ڕەوتی ئەو کەڵە پیاوانە بەرێ بکەین و ژیانمان بەقسەی شیرین و کردەوەی جوان و خورەوشتی بەرزو بانگەوازی بەردەوام وئارامگری بێ سنوور و دۆستایی‌تی یان لەگەڵ باوەڕداران و دژایەتیان لەگەڵ شەیطان و وشەیطان پەرستان بڕازێنینەوە.

لەکۆتایی ئەم قسانەدا پێمان باشە ئەو ڕستەیە بڵێین کە:

بەراستی گەورەترین غەدر لەچیرۆکی پێغەمبەران ئەوەیە کەتەنها وەك چیرۆکێکی سادەو ساکار وەریان بگرین وشەوانی ساردی زستان لەبەردەم زۆپای مزگەوت یان ماڵاندا بۆ خەڵکی باس بکەین !! ئازیزان مەبەستی سەرەکی لەگێڕانەوەی چیرۆکەکانی قورئان

تەنها خۆی لەچوار چێوەی باسێکی چیرۆکیدا نابینێتەوە بەڵکو مەبەست زۆر لەوە گەورەترە کە خوای گەورە بۆمان دیاری دەکات و دەفەرموێ:

﴿ لقد کان فی قصصهم عبرة لأولی الألباب ﴾ (یوسف : ١١١)

*واتە:* گێڕانەوەو باسکردنی چیرۆك و بەسەرهاتی پێغەمبەران بریتیە لە پەند وەرگرتن بۆ کەسانێك کە خاوەنی ژیرین.

لەبەر ئەوە پێویستە لەسەرمان کاتێ گەشت بەناو باخچەی پێغەمبەراندا دەکەین روداوەکانیان بەشێوەیەکی سادەو ساکار وەرنەگرین بەڵکو رووداو و بەسەرهاتەکانی بەشێوەیەکی راستی و واقعی وەربگرین و بانگەوازی ئەمرۆی خۆمانی لەسەر بەرێ بکەین چونکە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) پێشەنگ و مامۆستاو قدوەی سەرجەم مرۆڤایەتین لەهەموو کارێکی خێردا.

بەڵێ هەر لەبەر ئەوەیە کەئێمە وەك دڵسۆزێك بەرامبەر بەچیرۆکی پێغەمبەران هەستمان خرۆشاو دەستمان دایە نووسین لە دەربارەی زنجیرە چیرۆکی ئەو پێغەمبەرانەی کە لەقورئاندا باسیان لێوەکراوە و پاشان فەرموودەی راستی پێغەمبەر هاتووە لە بارەیانەوە .

بەراستی ئەمرۆ کتێبخانەی کوردی زۆر هەژارە لەبواری چیرۆکی پێغەمبەران و سەرجەم چیرۆکە قورئانیەکان بەگشتی ، ئێمە کاتێ وادەڵێین مەبەستمان ئەوەنیە کە بڵێین چیرۆکی پێغەمبەران بەکوردی نیە بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە کە بەوشێوە دورو درێژو پڕ مانایە نیە کە خەڵکی سوودی لێ وەربگرن و بیکەنە فاکتەرێکی عەمەلی لەژیانی رۆژانەو بانگەوازی خۆیاندا .

**هەر بۆیە بیرمان لەوە کردەوە کە ئەم زنجیرە چیرۆکە بنووسین بەم شێوەیە:**

١) سەرجەم ئەو ئایەت وفەرموودانە باس بکەین دەربارەی ئەو روداوە .

٢) بۆ مەبەستی راڤەکردن (تفسیر) ی ئایەتەکان چەندین جۆر تەفسیری بەهێزمان هێناوە کە لەسەر چاوەکاندا ئاماژەی بۆ کراوە.

٣) هەروەها بۆمەبەستی حەدیثەکانیش تەنها ئەو حەدیثانە بەبەلگە هێنراوە تەوە کە(بوخاری یان مسلم) ریوایەتیان کردوە بەتایبەتی ، هەروەها بەنیسبەت حەدیثی غەیری بوخاری و مسلم ئەو حەدیسانە شمان هێناوە کە ئەوان ریوایەتیان نەکردووە بەلأم لەلایەن زانایانی فەرموودەوە شاهیدی ڕاستێتی لەسەر دراوە و پاشان پلەی حەدیسەکە شمان دیاری کردووە بەشێوەیەکی گشتی.

٤) بێ گومان چیرۆکی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لەلایەن خەلکێکی عەوام ونەزان یان لەلایەن دوژمنانی ئیسلامەوە بابەتی زۆری خەیالّی و ئەفسانەی تێکەلّ کراوە و کراوە تە بەشێکی سەرەکی لەژیانی ئەو پێغەمبەرانەدا ، ئێمە لەم حالّەتەشدا هەلّساوین بەفرێدان و پشت گوێ خستنی هەموو ئەو ڕوداوە ئەفسانەو خەیالّیو بێ بەلگانەی کەباس کراوە و تەنها بەلگەمان بە (قرآن وحەدیثی صەحیحی) پێغەمبەر هێناوەتەوە لەباسەکانداو هیچی تر.

٥) بۆ هەموو بەندێك ، ڕووداوێك ، یان چەند ڕوداوێکی تایبەتیمان باس کردوە بەبەلگەی (قرآ ن و حەدیثی صحیح)پاشان کە ئەو بەندو بەسەورهات و ڕوداوە کۆتایی پێهاتووە نەچوینەتە سەر بەندو بەسەر هاتێکی تر بەلّکو بۆ سەلماندنی ئەو مەبەستە قورئانیەی کەدەفەرموێت: ﴿ لقد كان في قصصهم عبرة ﴾ هەلّساوین بەنووسین و دەرهێنانی سەرجەم پەندو ئامۆژگاری لەو بەندەداو تا پلەیەکی زۆریش هەولّمان داوە کە ئەو ڕوداوو بەسەر هاتە ببەستینەوە بەژیانی ئەمرۆی خۆمانەوە کە ئایا ئێمە ئەمرۆ وەك مسولّمانێك ی خاوەن پەیامی ئاسمانی وشوێن کەوتەی ئەو زنجیرە پێغەمبەرە چ سوودێك لەو ڕووداو و بەسەرهاتە وەردەگرین.

٦) پاشان لەگەلّ باس کردنی بەسە رهاتەکاندا چەند باسێکی ترمان نوسیوە بۆ ئەو مەبەستەی کە خوێنەری بەرێز تەواو ئاگاداری شارەزای ژیانی ئەو پێغەمبەرە ببێت و تەنها پرسیارێکی لەمێشکدا نەبێت دەربارەی ئەو باس وبەسەرهاتە.

٧) هەر قسەیەکمان کردبێ یان هەرباسێکمان کردبێ پشتمان بەستوە بەبەلگەیەکی بەهێز جا ئەو بەلگەیە یان (قرآن) ە یان حەدیسی صەحیحی پێغەمبەرە( ﷺ ) یان ووتەی زانایەکی زۆر لێ هاتووی ئیسلامە یان بەلگەی واقعە کە کەس لاری لێ نەبێت .

٨) سەرجەم باسەکان یەك بەدوای یەکدا هاتوون و پاش وپێشیان تێدا نیەو وەك پرۆژەیەکی بەرنامەیی وەهان کەسەرجەم باسەکانی بەدوای یەکتردا بێت و پاشان هەمووشیان پەیوەست بن بەوی تریانەوە.

## چەند تێ بینیەك دەربارەی ئەم کتێبە

١) سەرەتای ئەم کتێبە دەست پێ دەکات بەباس کردن و توێژینەوەیەکی زانستی دەربارەی دروست بوونی سەرەتای زەوی و ئاسمانەکان بەبەلگەی قورئان و پاشان زانستی پێش کەوتووی ئەمرۆ .

٢) بەندی یەکەمی ئەم چیرۆکە دەدوێ دەربارەی وویستی خوای گەورە دەربارەی دروست کردنی ئادەم و کاری جێ نشینی لەسەر زەویدا و پاشان دەیان باسی جۆراو جۆر ی تری لەخۆی گرتووە.

٣) بەندی دووەمی ئەم باسە ئاماژە بۆ جێگیر بوونی ئادەم و حەوا دەکات لەناو بەهەشدا و پاشان ئاگادار کردنەوەیان لەشەیطان و فێلەکانی و چەند باسێکی تر .

٤) پێداوەکانی بەندی سێ هەمی ئەم چیرۆکە باس لەهەردوو کوڕی ئادەم و حەوا دەکات کە بە( هابیل و قابیل ) ناسراون وپاشان دەدوێ دەربارەی ڕشتنی یەکەم دلۆپە خوێنی ناهەق لەسەر زەویدا و داهێنانی پیاو کوژی بۆ کەسانی دوای خۆی.

[illegible]) پێداچوونەوە بەسەر هاتەکانی بەندی چوارەم باس لەحیکمەتی درووست بوونی شەیطان دەکات ؟!.

٦) بەندی پێنجەمی ئەم بەسەرهاتە باسی ئەو ڕێگایانە دەکات کە شەیطان دەیان گرێتەبەربۆ مەبەستی گومراکردن و سەرلێشێواندنی بەندەکان بۆ ئەوەی لەدنیادا سەرلێشێواو بژین و لەدوا ڕۆژیشدا بەدۆزەخ شادبن.

٧) بەندی شەشەم باسی ئەو تایبەتمەندیانەی شەیطان دەکات کە تەنها پەیوەستن بەخودی شەیطان خۆیەوە وبەهۆیەوە دەناسرێتەوە.

٨) بەندی حەوتەم دەدوێ دەربارەی ئامۆژگاری خوای گەورە بۆ بەندەکان لەبەرامبەر شەیطان و هاوشێوەکانیدا بۆ ئەوەی نەکەونە ئەو چاڵانەی کەشەیطان هەڵی کەندووە بۆ بەندەکانی خوای گەورە وسەردەم چاڵەکەشی بەفەرش و ڕاخەری ڕازاوە داپۆشیوە.

٩) کۆتابەندی ئەم چیرۆکە دەدوێ دەربارەی چەند ووتەوئامۆژگاریەکی گرنگ بۆ خوێنەری بەڕێز کەلەسەر جەم ڕوداوەکانی ئەم کتێبە وەرگیراوە .

لەکۆتایدا داواکارین لەپەروەدگاری کار بەجێ و بەسۆز بەرامبەر بەندەکانی یارمەتیمان بدات و بەرەکەت بڕژێ بەسەر خامەکەی دەستمان و کاتی ژیانمان بۆ خزمەت کردنی بەرنامەکەی و تەواو کردنی ژیانی پێغەمبەران و بەچاپ گەیشتنی ( إن شاء الله) لەبەرگێکی ڕزاوەی جوانی سەرنج ڕاکێشەردا و بەومەبەستەی ئەم نوسراوەمان ببێتە کەفارەتی تاوانەکانمان و توێشوی ڕۆژی قیامەتمان و زیاتر پەیوەست بوون و بەردەوام بونمان لەسەر دینی پاك و بێ گەردی ئیسلام ( امین )...

والسلام علیکم ورحمه الله وبرکاته ...

( اللهم اجعل عملنا کله صالحا واجعله کله خالصا)

هێمن بهاء الدین قەرەداغی — دانا عثمان حسن

١٤١٨ی کۆچی — ١٩٩٨ی زایینی

سلێمانی

# سەرەتایەك دەربارەی دروست بوونی زەوی و ئاسمانەکان

بەپێویستمان زانی پێش ئەوەی بچینە خزمەت باس کـردن و ڕاڤـە کردنـی ئـەو ئایـەت و فەرموودانەی باس لەدروست بوون ی ئادەم دەکەن سـەرەتایەك دەربـارەی دروسـت بوونـی زەوی و ئاسمانەکان بنووسین وپاشان دەربارەی ئادەم و بابەتەکانی تر بدوێین.

چونکـە گومـانی تێدانیـە کـە زەویو ئاسمانـەکان لـەپێش دروسـت بوونـی ئادەمەوەیـە بەبەلگە ی ئەو ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وعلـــم آدم الأسمـــاء کلـــها ﴾ (البقرة: ٣١) *واته :* پاش ئەوەی ئادەممان دروست کرد و گیانمان کرد بەبەریدا ناوی سەرجەم ئەو شتانەمان فێرکرد کە لەزەویو ئاسمانەکاندا هەبوو.

بەڵێ گەر سـەرێك بدەیـن لەسـەرەتای دروسـت بوونـی بوونـەوەر لەڕوانگـەی قورئانـەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە زەوی وئاسمانەکان لەسەرەتای دروست بوونیدا چی بوون.

لەسەرەتادا زانایـان بـیرو بـۆ چوونیـان وابـوو کـە زەوی و ئاسمانـەکان بریتـی بـووە لـە (تـەمێکی چـڕو پـڕ) بـەلاّم زانایـانی دوای ئـەمان ئـەم بـیردۆز وبـۆ چوونـەیان بەهەڵـە دانـاوو قسەیەکی تریان دەربارەی سەرەتای دروست بوونی زەوی و ئاسمانەکان ڕاگەیاند .

بـەڵێ زانــای بـەناوبانگی یابــانی ( یوشـیودی کـوزان) کـە بەڕێوەبـەری مەرصـەدی (طۆکیۆیە) دەڵێ : ( هەندێ لەزانایان باوەڕیـان وابـوو کـە زەوی و ئاسمانـەکان لەسـەرەتادا (تەم بووە) بەلاّم ئەم بۆچوونەیان هەڵە دەرچوو چونکە ( تەم ) لەسـاردوو سـەرماوە پـەیدا دەبێت و قابیلی تەقینەوە نیە ! ! کەواتە ڕاسترین و پەسەند ترین بیردۆز ئەوەیە کەبلێین: زەوی و ئاسمانەکان لەسەرەتادا بریتی بوو ن لەپارچەیەك دوکـەڵ (دخـان) چوونکـە دوکـەڵ لەگەرماوە پـەیدا دەبێـت [1] و گومـانی تێـدا نییەکـە زەوی و ئاسمانــەکان لەئـەنجامی تەقینەوەیەکیگەورە لەیەکتری جیابوونەوە هەروەك خوای گـەورە ئـەم ڕاسـتیەمان بـۆ بـاس دەکات و دەفەرموێت:

---

(١) أنه الحق / د. عبد المجيد زنداني (ص: ٣٩).

﴿ أولم ير الذين كفروا أن السموات والأرض كانتا رتقا ففتقناهما وجعلنامن الماء كـــل شيء حي ﴾ (سورة الأنبياء : ٣٠). *واتە:* ئەو کەسانەی بێ باوەڕن بەرامبەر بەخوای گەورە بۆ سەیرێکی زەوی و ئاسمانەکان ناکەن کەیەکپارچە بوون لەپاشاندا لەیەکترمان جیاکردەوە پاشان لە( ئاو ) هەموو شتێکی زیندوومان دروست کردوو بەدی هێنا .

بەڵێ خوای گەورە باس دەربارەی یەکەم گەوهەری زەوی دەکات پاش ئـەو تەقینـەوەو لەیەکتر جیاکردنەوەیە کە ئاوە ، هەروەك دەفەرموێت : ﴿ أخرج منها ماءها ومرعاها... ﴾

واتـە : پـاش سـارد بوونـەوەی زەوی و جیابوونـەوەی لەئاسمانـەکان یەکـەمین شـتێ کەلەسەر زەویدا پەیدا بوو بریتی بوو لە(ئاو) هەربۆیـە لەئایەتەکـەی سـەرەوەدا دەفـەرموێت ﴿ وجعلنا من الماء كل شئ حي ﴾

(إبن عباس و مجاهد ) وهەندێکی تـر لـەو زانا پایە بەرزانـە لەڕاڤـەی ئـەو ئایەتـەی کـە دەفەرموێت ﴿ كانتا رتقا ففتقناهما ﴾ دەڵێن : (كانتا ملتزقتين أو ملتصقتين ففصلتا) [1]
*واتە :* یەك پارچە و یەك ماددە بوون و لەیەکتر یمان جیاکردەوە.

بەڵێ قورئان پێش چواردە سەدە باس لەدروست بوونی زەوی و ئاسمانەکان دەکات کـە دەفەرموێت ﴿ ثم استوى الى السماء وهي دخـــان ﴾ (فصلت: ١١)..واتـە: کاتـێ ویسـتمان ئاسمانەکان دروست بکەین کە پارچەیەك دووکەڵ بوو .

سەرنج بدە بەڕاستی ئایەتەکانی قورئان سەرجەم ئەو ڕاستیە زانسیتانەی بـاس کردووە کە زانستی ئەمڕۆ وورده وورده باسیان لێوەدەکات و ( بەحقیقەتی علمیان ) دەداتە قەڵەم.

یـەکێك لـە هــەرە تایبەتمەنیـە بـەرزەکانی ئیسـلام ئەوەیـە کـە دینێکـی گشـتیـیە واتە(شمولیە) وتەنها شتێك نەماوە لەزەوی و ئاسمانەکان و ژیانی مرۆڤـەکان و پاشـەڕۆژیان کە باسی لێوە نەکردبی و ڕوون کردنەوەی دەربارەی نەخستبێتە ڕوو هەروەك خوای گـەورە دەفەرموێت : ﴿ ولقد صرفنا في هذا القرآن للناس من كل مثـل ... ﴾ (الكهف: ٥٤)..واتـە: هەمووشتێکمان لەم قورئانەدا بۆ خەڵکی باس کردووە .

---
(١) هەمان سەرچاوە (لاپەڕە ٢٧)

زەوی و ئاسمانەکان لەماوەی (٦) رۆژ دروست کراون و هەموو پێداویستیەکانی مرۆڤ و سەرجەم گیان دارانی تری تێدا دابین کراوەو و رێکخرا هەروەک قورئان دەفەرموێت:

﴿ ولقد خلقنا السموات والأرض وما بينهما في ستة أيام ... ﴾ (ق: ٣٨)..واتە : زەوی و ئاسمانەکانمان لەماوەی شەش رۆژ دا دروست کرد.

## بەندی یەکەم : ویستی خوای گەورە دەربارەی دروستکردنی ئادەم وکاری جێنشینی لەسەر زەویدا

...بێ گومان پێش دروست بوونی ئادەم دوو جۆر دروست کراوی تر هەبوون کە بریتی بوون لە فریشتە و پەری (الملائكة والجن ) کەلەسەرەتای ئەم باسەدا پێویست بەناساندن و پێناسەکردنی هەریەکەیان دەکات.

### یەکەم : ( فریشتە ) الملائكة

فریشتە بریتین لەو کۆمەڵە دروست کراوەی خوای گەورە کەلە پێش ئادەمەوە خوای گەورە دروستی کردوون بەبەڵگەی ئەم ئایەتەی خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ واذ قال ربك للملائكة اني جاعل في الارض خليفة ﴾ (البقرة: ٣٠) واتە :کاتێ خوای تۆ ئەی ( محمد ) فەرمووی بەفریشتەکان کەوا من –واتە خوا– جێ نشینێ لەسەر زەویدا دادەنێم . بێ گومان ئەمە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەپێش دروست بوونی ئادەم فریشتە هەبوون و گفتوگۆیان لەگەڵ پەروەردگار کردووە . هەروەها ئەم فریشتانە کۆمەڵێکی پاکن و دوورن لەهەموو گوناهوسەرپێچیەکەوە و چەند سیفەت و تایبەت مەندێتیەکیان هەیە کە بریتین لە:

١– لە نوور دروست کراون هەر وەک پێغەمبەر ( ﷺ) دەفەرمێت: ((خلقت الملائكة من نور)) (رواه مسلم ) واتە : فریشتە لە رووناکی دروست کراون .

٢– هەموو کات لەگوێ رایەڵی خوای گەورەدان و سەرپێچیی ناکەن هەروەک قورئان دەفەرمێت : ﴿لايعصون الله ماامرهم ويفعلون مايؤمرون ﴾ (التحريم: ٦) . واتە : کاتێ

خوای گەورە فەرمانیان پێ دەکات بەکردنی کارێك دەست بەجێ فەرمانەکەی جێ بەجێ دەکەن و سەرپێچی لێ ناکەن .

(٣) نەدەخۆن و نەدەخەون بەڵکو بەردەوام لەپەرستشی خوای گەورەدان .

(٤) نەنێرن و نەمێ و نەزاوزێ دەکەن .

(٥) نەفسیان نیە و لەگیانێکی پاك و دور لەهەموو خراپە و تاوانێك دروست بوون .

تێبینی : خوێنەری بەرێز ئاگادار دەکەین کە بۆ زیاتر شارەزا بونیان دەربارەی فریشتەکان با سەر بدەن لەکتێبی (عالم الملائكة الابرار )ی دکتور (عمر سليمان الاشقر ) .

## دووەم : پەری ( الجن )

هەروەها پەریش بریتین لەجۆرێکی تر لە دروست کراوەکانی خوای گەورە و ئەمانیش هەروەك فریشتەکان لەپێش ئادەم و ئادەمیزادەوە دروست بوون بەبەلگەی ئەو ئایەتەی کە دەفەرمێت : ﴿ والجان خلقناه من قبل من نـار ﴾ (الحجر: ٢٧) واتە: وە پەریمان لەپێش مرۆڤەوە دروست کرد لەئاگر . مانای (خلقناه من قبل)..واتە : أي من قبل الانسان (١)

بێ گومان پەریش چەند سیفەتیکی تایبەتی و سەربە خۆی خۆیان هەیەکەبریتین لە:

(١) لەئاگر دروست کراون هەروەك خوای گەور دەفەرمێت: ﴿ والجان خلقناه من قبـل من نار ﴾. واتە : پەریمان لەپێش ئادەمیزاد دروست کرد لەئاگر . (ابن عباس) (ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرمێت (من احسن النار)(١) واتە : لەپاڵفتەی ئاگر .

هەروەها (عمری کوڕی دینار) یش دەفەرمێت : (من نار الشمس)(٢) واتە : پەری لەئاگری خۆر دروست کراون .

هەروەها پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرمێت : ((وخلقت الجان من مارج من نار))(٣) واتە : جنۆکە لە پاڵفتە ئاگرێکی تێکەڵاوکراو دروست کراوە.

---

(١)تفسير ابن كثير /ج(٢)ص(٥٠٤) (٢) هەمان سەرچاوە (٣) رواه مسلم

(راغبی اصفهانی) لەتەفسیری ووشەی (مارج دا) دەفەرمێت : (المرج یعني الخلط والمرج الاختلاط )[١] واتە : مەرج واتە تێکەڵاوکراو.

(١) تواناو دەسەڵاتیان لەمرۆڤەکان زۆر ترە .[٢]

(٢) ئەوان ئێمە دەبینن و ئێمە ئەوان نابینین وەك قورئان دەفەرمێت: ﴿ انه یراکم هو وقبیله من حیث لاترونهم ﴾ واتە : جنۆکە ئێوە دەبینن و ئێوە ئەوان نابینن .

تێبینی: هەر بەڕێزێك خوا زیاری زیاتر شارەزابونی هەیە دەربارەی جنۆکە و شەیتانەکان باسەر بدات لە کتێبی (عالم الجن والشیاطین)ی دکتۆر (عمر سلیمان الاشقر).

## قۆناغەکانی دروست بوونی ئادەم ( علیه السلام )

گەر سەرنجێکی وردی ئایەتەکانی قورئان بدەین دەربارەی دروست بوونی ئادەم ئەوە ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێت کەخوای گەورە دەست بەجێ ئادەمی دروست نەکردوو گیانی نەکرد بەبەریدا . بەڵکو پلەپلە ئادەمی دروست کردو و پاشان گیانی کرد بەبەریدا ، کەهەر یەك لەئایەتەکان باس لەیەکێ لەو قۆناغانە دەکات کە ئەمانەن .

قۆناغی یەکەم : دروست کردنی ئادەم لەگڵێکی ووشك . یەکەم قۆناغی دروست بوونی ئادەم بریتی بوو لەکۆکردنەوەی نمونەی سەرجەم خۆڵەکانی سەرزەوی و دروست کردنی ئادەم لێ ی، هەر وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((ان الله خلق آدم من قبضة قبضها من جمیع الارض))[٣] واتە : خوای گەورە ئادەمی دروست کرد لە هێنان و تێکەڵ کردنی هەموو جۆرە گڵێکی سەر زەوی .

بەو مانایەی کەلەسەر زەویدا و لەچەند شوێنێکی جیاوازدا گڵ هێنراوەو و تێکەڵ کراوە و ئادەمی لێ دروست کرا خوای گەورەش دەفەرموێت :

---

(١) مفردات الفاظ القرآن (راغب اصفهاني) (ص: ٧٦٤).
(٢) سورەتی (النمل) ئایەتی (٣٩)

(٣) رواه ابو داود و ترمذي و قال ترمذي حسن صحیح . هەروەها ( قصص الانبیاء )ی ابن کثیر (ص/ ٢٧)

﴿ واذ قال ربك للملائكة اني خالق بشرا من صلصال من حمأ مسنون ﴾ (الحجر: ٢٨)
واتە: ئەی (محمد) ( ﷺ) باس بکەو یادی خەڵکی بهێنەرەوە کاتێ خوای گەورە فەرمووی بەفریشتەکان کەوا من (مرۆڤ لەگڵێکی ووشك و پاشان لەقوڕێکی سورەوەنەبووی ڕەش دروست دەکەم . وە زۆربەی (مفسرین) لەتەفسیری دروست کردنی ئادەم دا دەفەرموون (خلق الله تعالى آدم عليه السلام من طين فصوره وتركه في الشمس اربعين سنة ، فصار صلصالا كالخزف ولايدري احد ما يراد به . ولم يروا شيئا من الصور يشبه الى ان نفخ فيه الروح)[1] واتە: خوای گەورە ئادەمی دروست کرد لەقوڕ و وێنەی کێشا پاشان لەبەر خۆردا دایناو وازی لێ هێنا بۆ ماوەی (٤٠) ساڵ بەهۆی تیشکی خۆرەوە ڕەق بویەوە و کەس نەیدەزانی کە چیەو چیٚ لێ پێك دێت ، هەروەها هیچ شتێك نەبینرابووکە لەو شێوەیە بکات تا ئەوکاتەی کە ڕوح کرا بەبەریدا.

(فخرالدين ی ڕازی) دەربارەی ئەم ئایەتە دەفەرمێت : (وحقيقة الكلام انه تعالى خلق آدم من طين على صورة الانسان فجف فكانت الريح اذا مرت به سمع له صلصلة فلذلك سماه الله تعالى صلصالا)[2].

هەروەها ابن عباس و قتادە و مجاهد . دەربارەی ووشەی (صلصال) دەفەرموون: (المراد بالصلصال هاهنا التراب اليابس)[3] واتە: مەبەست لە صلصال بریتیە لە گڵێکی ووشك.

<u>قۆناغی دووەم</u> : پاش ئەوەی خوای گەورە ئادەمی لەسەرجەم خۆڵەکانی سەر ڕوی زەوی دروست کرد . قۆناغێکی تر لەدروست بوونی ئادەم دەستی پیٚ کرد کە بریتی بولە(وێنەکێشان و ڕێکسازی کردن تێدا)(التصوير والتسوية) .

خوای گەورە لەباسی ئەم قۆناغەدا دەفەرمێت : ﴿ ولقد خلقناكم ثم صورناكم ﴾ (الاعراف:١١) واتە : پاش ئەوەی ئادەم مان دروست کرد وێنەیمان کێشا .

(١)التفسير الكبير (فخرالدين الرازي) (مفاتيح الغيب) ج١٩-٢٠/ ص١٧٩
(٢) هەمان سەرچاوەی پێشو . (٣) تفسير أبن كثير / ج٢ (ص٥٠٤)

هەروەها دەربارەی کاری ڕێکسازی لە ئادەمدا دەفەرمێت :﴿ فاءذا سويته ﴾ (حجر: ٢٩)
واتە : لەپاش دروست کردنی ئادم ڕێکسازیم تێدا ئەنجام دا. بەواتایەکی تر ئادەم ڕاستەوخۆ بەدەستی پەروەردگار دروست کرا .

قۆناغی سێهەم : پاش ئەوەی کە خوای گەورە وێنەی ئادەمی کێشا و کاری ڕێکسازی و جوان کاری لە ئادەمدا ئەنجامدا . قۆناغی سێهەم دەستی پێ کرد کەبریتی بوو لە( ڕوح کردن بەبەری ئادەمدا ) خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرمێت: ﴿ فـإذا سـويته ونفخت فيه من روحي ﴾ (ص: ٧٢) واتە: پاش ئەوەی ڕێکسازیمان لەئادەمدا ئەنجامدا . پاشان ڕوحمان کرد بەبەریدا و ئادەم بوو بە دروست کراوێکی زیندو.

کەواتە تا ئێرە دەتوانین قۆناغەکانی دروست بوونی ئادەم بکەین بەسێ بەشەوە
(أ) دروست کردنی ئادەم لەگڵێکی ووشك و تێکەڵ کردنی لەگەڵ ئاودا تا بوو بەقوڕێکی ڕەقی ڕەش .
(ب) وێنەکێشان و چاك سازی و ڕێك سازی لەئادەمدا .
(ج) پاش ئەم دوو قۆناغە کۆتا قۆناغی دروست بونی ئادەم دەستی پێ کرد کەبریتی بوو لەڕوح کردن بەبەری ئادەمدا.

## ویستی پەروەردگار دەربارەی جێ نشینی ئادەم لەسەر زەویدا

سەرەتای ئەم ڕوداوە بەگفتوگۆ دەست پێ دەکات لەنێوان خوای گەورە و فریشتەکاندا ئەویش بەوەی کە: خوای گەورە فەرمووی بە فریشتەکانی کەمن دەمەوێت جێ نشینێ لەسەر زەویدا جێگیر بکەم و دابنێم ، لەم کاتەدا فریشتەکانی خوای گەورە دەربارەی ئەم هەواڵە ئەم چەند قسە یان فەرموو بەپەروەردگاریان .
(أ) ئەی پەروەردگارمان یەکێ دەکەیتە جێ نشینی خۆت لەسەر زەویدا کە بەدکاری و کاری ناشرین و ناپەسەند ئەنجام بدات ؟!

(ب) ئەی پەروەردگارمان شەرەفی جێ نشینی دەبەخشی بەکەسێ کە خوێن بەناهەق برێژێ و دەست بداتە ڕەشە کوژی ؟!

(ت) ئەی پەروەردگارمان ئێمە بەردەوام لە پەرستش و دەربڕینی پاك و بێ گەردین بۆ بەرزیوبێ هاوەڵی تۆ ؟! خوای پەروەردگاریش بەم جۆرە وەڵامی دانەوە : ڕاستە ئێوە بەردەوام لە پەرستش و شوکرانە بژێری منداان بەڵام ئەوەی من دەی زانم ئێوە نایزانن ؟! بەو واتایەی کەئێوە تەنها سەیری ڕوکەش ی ئەم کارە دەکەن و بەزانیاری کەم و سنور داری خۆتان ئەم هەواڵ و ڕوداوە هەڵدەسەنگێنن بەڵام من لەناوەڕۆك و داهاتوی ئەم کارە باش دەکۆڵمەوە و زانیاریی بێ سنورم هەیە دەربارەی،قورئان لەم بارەوە دەفەرموێت:

﴿ واذ قال ربك للملائكة اني جاعل في الارض خليفة قالوا اتجعل فيها من يفسد فيها ويسفك الدماء ونحن نسبح بحمدك ونقدس لك قال اني اعلم مالا تعلمون ﴾ (البقرة :٣٠)

بەڵێ پاشان خوای گەورە بۆ سەلماندنی زانیاری بێ سنوری خۆی و سەلماندنی زانیاری سنور داری فریشتەکانی ئادەمی هێناو فێری سەرجەم ناوەکانی سەرزەوی کرد بەشێوەیەکی گشتی -واتە: ئادەممان فێری ناوی سەرجەم دروست کراوەکانی خۆمان کرد لەسەر زەویدا ...پاشان خوای گەورە بۆ سەلماندنی زانیاری بێ سنوری خۆی و بەڕێزی ئادەم بەفریشتەکانی فەرموو : (ئەگەر ڕاست دەکەن و دەڵێن ئێمە باشترین بۆکاری جێ نشینی لەسەر زەویدا و ئەواناوی ئەو شتانەی سەرزەوی تایبەت مەندیەکانیم پێ بڵێن ؟!) پاشان فریشتەکان دەست بەجێ بێ توانایی و بێ زانایی خۆیان دەربڕی ووتیان بەخوای گەورە : پاك و بێگەردی بۆ تۆ ئەی پەروەردگارمان زانیاری دار نین ئێمە تەنها ئەوەندە نەبێت کە فێرت کردوین . بەڕاستی هەر زاتی تۆ زانیاریی بێ سنوری هەیە دەربارەی هەموو شتێ ، ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی تۆ کارەکان زۆر بە لێ زانانە ئەنجام دەدەیت و بڕیار لەسەر کاری ناتەواو نادەیت خوای گەورە دەربارەی ئەم ڕوداوە دەفەرموێت : ﴿ وعلم آدم الأسماء كلها ثم عرضهم على الملائكة فقال أنبئوني بأسماء هؤلاء ان كنتم صادقين ، قالوا سبحانك لاعلم لنا الا ما علمتنا انك انت العليم الحكيم ﴾.

بەڵێ گفتوگۆ کەبەردەوامە و جارێ کۆتایی نەهاتووە و پلەپلە خوای گەورە زانیـاری بـێ سنوری خۆی دەردەخات و ڕێزی ئادەم لەبەردەم فریشتەکاندا زیاد دەکات ئەویش بـەوەی : ( پاشان خوای گەورە ئادەمی بانگ کـردوو پێـی فـەرموو : ئـەی ئـادەم نـاوی ئـەو شتانەی کەفێرمان کردوین بڵێ بەفریشتەکان لەم کاتەدا ئادەم (علیە السلام) دەست بە جێ و زۆر بە وورپای ناوی هەموو ئـەو شـتانەی ووت کـە لـەوەو پێـش خـوای گـەورە فـێری کردبـوو .لـەم کاتەدا فریشتەکان بۆیان ڕوون بووەوە و سەلما بۆیان کەئەو زانیارییـەی هەیانـە زانیارییـەکی سنوردارە، بـەڵێ لـەم کاتـەدا خـوای گـەورە یـادی فریشـتەکانی خسـتەوە ، بـەزانیاریی بـێ سنوری خۆی و فەرمووی : (ئەی فریشتەکان پێم نەوتن کـەوا مـن -واتـە خـوا -هـەموو دیـار نەبوویـەك لـەکار و کـردار لـەزەوی و ئاسمانـەکاندا دەزانم و زاناشـم بـەو شـتانەی کـە دەری دەبڕن و بەو شتانەش کـە لـەناخی خۆتـاندا دەی شـارنەوە . خـوای گـەورە دەربـارەی ئـەم گفتوگۆیە دەفەرمێت ﴿ قال یاآدم أنبئهم بأسمائهم فلما أنبئهم بأسمائهم قال ألم أقل لكـــم اني أعلم غیـب السموات والارض وأعلم ما تبدون وما كنتم تكتمون ﴾ (البقرة : ٣٣).

## فەرمانی پەروەردگار بەکڕنوش بردن بۆ ئادەم و سەرپێچی کردنی (إبلیس)

پـاش ئـەو گفتووگۆ فـراوان و بـەرچاوەی کەکۆمـەڵێك ڕاسـتیی زۆری تێدادەرکـەوت بـۆ فریشتەکان خوای گەورە پێی فەرموون: ئەی فریشتەکان ئێستا دەزانن کـەوا ئـادەم لـەئێوە شیاو ترە بۆ کاری جێ نشینی لەسەر زەویدا و لـە ئێـوە زانـاترە دەربـارەی نـاوی دروسـت کراوەکانم لەسەر زەویدا کەواتە ئێستا فەرمانتان پێدەکەم کە کڕنوشی ڕێز ببەن بۆ ئـادەم ، لەم کاتەدا سەرجەم فریشتەکان کڕنوشیان بردو فەرمانەکەی پەروەدگاریان جێ بـەجێ کـرد تەنـها (إبلیـس) نـەبێت کـە خـۆی بەگـەورە دانـاو بەرپـەرچی فەرمانەکـەی خـوای دایـەوە .

هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وإذ قلنا للملائكة اسجدوا لآدم فسجدوا إلا إبليس أبى واستكبر وكان من الكافرين ﴾ (البقرة: ٣٤)

هەروەها لە سورەتی (الاعراف)دا دەفەرموێت : ﴿ ثم قلنا للملائكة اسجدوا لآدم فسجدوا إلا إبليس لم يكن من الساجدين ﴾ (الاعراف: ١١)، هەروەها لە( كهف) دا دەفەرمێت : ﴿ وإذ قلنا للملائكة اسجدوا لآدم فسجدوا إلا إبليس كان من الجن ففسق عن أمر ربه ﴾ (كهف: ٥٠) .هەروەها لە سورەتی (الحجر) دا دەفەرمێت : ﴿ فسجد الملائكة كلهم أجمعون (٣٠) إلا إبليس أبى أن يكون مع الساجدين ﴾ (الحجر : ٣٠-٣١) هەروەها لەسورەتی (ص) دا دەفەرمێت : ﴿ فسجد الملائكة كلهم اجمعون، إلا إبليس استكبر وكان من الكافرين ﴾ (ص: ٧٣-٧٤). هەروەها لە سورەتی (الاسراء)دا دەفەرمێت : ﴿ وإذ قلنا للملائكة اسجدوا لآدم فسجدوا الا إبليس ...﴾ (الاسراء : ٦١) .

## هۆکاری کڕنوش نەبردنی إبلیس بۆ ئادەم و سەرپێچی کردنی فەرمانی پەروەردگاری

پاش ئەوەی خوای گەورە (فەرمانی کرد بەکڕنوش بردنی ڕێز بۆ ئادەم سەرجەم فریشتەکان فەرمانەکەی خوای گەورەیان جێ بەجێ کرد بەڵام تەنها (إبلیس)بەرپەرچی فەرمانەکەی خوای گەورەی دایەوە و لەفەرمانی پەروەردگاری دەرچوو، لەم کاتەدا خوای گەورە بە( إبلیس ) ی فەرموو: ﴿ قال مامنعك ألاتسجد إذ أمرتك ﴾ ؟ واتە : ئەی (إبلیس) چی وای لیّ کردی و کاری تێ کردی کەکڕنوش نەبەیت بۆ ئادەم و بەرپەرچی فەرمانەکەی من بدەیتەوە ؟! لەم کاتەدا (إبلیس)ی سەرکەش و لاسار لەسەر فەرمانی خوای گەورە بۆ مەبەستی پاساو هێنانەوە بۆ هەڵە و تاوان و پاشەڵی پیسی خۆی ئەم پێوەرە فاسد و بێ ناوەڕۆکەی بەکار هێناو ووتی: ﴿ قال أنا خير منه خلقتني من نار وخلقته من طين ﴾ ؟! (الاعراف: ٢١).واتە : (إبلیس) ووتی لەبەر ئەوە کڕنوشم بۆ ئادەم

نەبرد چونکە من لەو زۆر بەرێز ترم ! ئەی خوایە منت لەئاگر دروست کردووە و ئادەمیش لەقوڕ ؟! کەواتە هەرگیز من کە لەئاگر دروست کراوم کڕنوش نابەم بۆ ئادەم کە لەقوڕ دروست کراوە . هەروەها لە سورەتی(الحجر)دا دەفەرمێت :﴿ قال یا إبلیس مالك ألا تكون مع الساجدين؟، قال لم اكن لأسجد لبشر خلقته من صلصال من حما مسنون ﴾ (الحجر: ٣٢-٣٣) . واتە : ئەی( إبلیس ) چی وای لێ کردیت کە لەگەڵ کڕنوش بەران نەبیت لەگەڵ فریشتەکان ؟! (إبلیس) لەوەڵامدا وتی : من هەرگیز کڕنوش بۆ مرۆڤێك نابەم کەلەقوڕێکی ووشکەوە بووی ڕەش هەڵگەڕاو دروستت کردبێت !! هەروەها لەسورەتی (الاسرا ء) دا دەفەرمێت : ﴿ قال ءأسجد لمن خلقت طينا ﴾ (الاسرا ء-٦١)

واتە : ( إبلیس ) ووتی ئایا کڕنوش بەرم بۆ یەکێ کەلەقوڕ دروستت کردبێت . هەروەها لە سورەتی (ص)دا دەفەرموێت : ﴿ قال يا إبليس مامنعك أن تسجد لما خلقت بيدي أستكبرت أم كنت من العالين ، قال أنا خير منه خلقتني من نار وخلقته من طين ﴾ (ص: ٧٥-٧٦) . واتە: ئەی (إبلیس )چی وای لێ کردی کە کڕنوش نەبەیت بۆ ئەو جۆرە دروست کراوەی من کە بەدەستەڵاتی خۆم دروستم کردووە ؟ ئایا خۆت زۆر بەگەورە دەزانیت کەلەگەڵ ئەوەدا کە شیاوی گەورەیی نیت و لەناخی خۆتدا خۆت بەیەکێ لەبەرز فڕەکاندا دەبینیت ؟

## سزای خوای گەورە بۆ ( إبلیس )

کاتێ (إبلیس) بەرپەرچی فەرمانەکەی خوای گەورەی دایەوە و خۆی بەباشتر و چاکتر زانی لەئادەم و ئامادە نەبوو کە کڕنوش بۆ ئادەم ببات لەم کاتەدا دەبێت سزای توندی خوای گەورە بۆ ئەم سەرکەشە لەفەرمان دەرچووە دەبێت چی بێت ؟! ئاخۆ دەبێت خوای گەورە تەوبە و پەشیمانی (إبلیس) وەربگرێ لەپاش سەرپێچی یەکەی ؟!

ئاخۆ دەبێت خوای گەورە لەسزای ئەو سەرکەشەدا بەبەزەیی بێت یان تۆڵە سێنەرەوەبێت ؟! ئاخۆ دەبێت سزای (إبلیس) هەر لەو کاتەدا بەئەنجام بگات یان دوا

بخرێت بۆ ڕۆژی دوایی؟! بەڵێ خوای گەورە دەست بەجێ و هەر لەوێ دا سزایەکی کاتی بۆ (إبلیس) دیاری کردو و لە ڕەحم و سۆزی خۆی کردیە دەرەوە . هەر وەك (سید قطب) دەفەرمێت : ( لقد طرد من الجنة ، وطرد من رحمة الله ، وحقت عليه اللعنة ، وكتب عليه الصغار ).[1] واتە : لەوکاتەدا (إبلیس) لەبەهەشت دەرکرا ،لەبەزەیی خوای گەورە دەرکرا هەروەها بێ بەش بوو لەبەزەیی خواوبو بەخەڵاتێك و بەدیاری کرایە گەردنی و پاشان لەڕیزی بچکۆلە و بێ ڕێزەکاندا تۆمار کرا .

هەروەك قورئان لەم بارەیەوە دەفەرمێت : ﴿ قال فاخرج منها فانك رجيم ، وإن عليك اللعنة إلى يوم الدين ﴾ (الحجر: ٣٤-٣٥) ( دکتور مصطفى خرم دل ) لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرمێت : ﴿ قال الله تعالى إذا كنت متمردا خارجا على طاعتي ، فاخرج من الجنة فإنك مطرود من رحمتي ومن مكان الكرامة ﴾[2]

واتە: خوای گەورە دەفەرمێت :ئەی (إبلیس) مادام تۆ سەرکەش بوویت و دەرچوویت لەفەرمانی من کەواتە دەربچۆ لەبەهەشت ، چونکە تۆ لەبەزەیی من دەرکراویت و هەروەها بێ بەشی لەشوێنی ڕێزداران . هەروەها نوسرا لەسەرت کەبێ بەش بیت لەسۆزی من تارۆژی دوای .لە سورەتی (ص)دا دەفەرمێت: ﴿ قال فاخرج منها فانك رجيم ، وإن عليك لعنتي إلى يوم الدين ﴾ (ص: ٧٧-٧٨). واتە : لەبەزەیی من بچۆ دەرەوە چونکە تۆ لەوانەی کەبێ بەشیت لەسۆزی من ، هەروەها نەفرینی خوایت لەسەر نوسرا تا ڕۆژی دوایی، خاوەنی تەفسیری (کشاف) دەربارەی ڕاڤەی ئەم ئایەتە دەفەرمێت : ( اللعنة باقية عليه في الدنيا ، فإذا جاء يوم القيامة جعل مع اللعنة أنواع من العذاب تصير اللعنة مع حضورها منسية ) [3] واتە: ئەم جۆرە نەفرینەی خوای گەورە لەسەر (إبلیس) بەردەوامە لەدنیادا ، کاتێك کەڕۆژی دوایش هات لەگەڵ ئەو نەفرینەدا چەندین جۆر سزای سەخت سەخت دەدرێت کە ئەوەندە توندە نەفرینەکەی لەبیردەچێتەوە کەلەدونیادا لێ کراوە.

(١) في ظلال القرآن/ج-٣-ص(٤٧٧)

(٢) تفسير مقتطف/مصطفي خرمدل(ص٤٥٩). (٣) تفسير الكبير ج/٢.

## داواکاریی ( إبلیس ) لەخوای گەورە

پاش ئەوەی (إبلیس) بێ باوەڕی و سەرپێچیی خۆی نواند لەبەردەم خوای گەورەدا و دڵنیا بوو لەوەی کەبەر نەفرینی پەروەردگاری کەوتووە و لەبەخشندەیی و سۆزی خوای گەورە کراوەتە دەرەوە ، لەم کاتەدا (إبلیس) دەبێت خوازیاری چی بێت لەخوای گەورە ؟! ئاخۆ دەبێت داوا بکات و بڵێ ئەی پەروەردگارم بم مرێنە و لەناوم ببە لەخەجاڵەتی و ڕیسوایی خۆم ؟! بەڵام نە ، (إبلیس) ئەم ڕسوای و بێ ڕێزییەی کە بەسەریدا براپەوە و لەبەهەشت و ئەو ناز و نیعمەتانە دەرکرا ، هەروا بەئاسانی ئامادە نییە دەستی لێ هەڵبگرێ . هەر بۆیە لەم کاتەدا ، داواکاری یەکی هەبوو لەخوای گەورە کە ووتی: ﴿ أنظرني الی یـوم یبعثون ﴾ واتە : ئەی خوایە بم هێڵەرەوە تا ڕۆژی دوایی، هەروەها لەسورەتی (الحجر)دا دەفەرموێت :﴿ قال رب فاظرني إلی یوم یبعثون ﴾ (الحجر-٣٦).

## وەڵامی خوای گەورە بەرامبەر بە داواکارییەکەی ( إبلیس )

کاتێك (إبلیس) داواکاری یەکەی دەربڕی لەبەردەم خوای گەورەدا بەوەی کە بواری بدات و نەی مرێنێ تا ڕۆژی دوایی بۆ مەبەستی سەندنەوەی تۆڵە لە ئادەم و نەوەکانی و بەرەو دۆزەخ بردنیان ، لەم کاتەدا خوای گەورە دەست بەجێ وەڵامی (إبلیس) دەداتەوە و پێی دەفەرموێت : ئەی (إبلیس) داواکارییەکەتمان قبول کرد و تا ڕۆژی دوای نات مرێنین . هەر وەك قورئان باسی ئەم حاڵەتەمان بۆ دەکات و دەفەرموێ : ﴿ قال إنك من المنظرین ﴾ (الاعراف: ١٥).

## هەڕەشەی شەیتان بۆ ئادەم و نەوەکانی

(إبلیس)ی دەرکراو و نەفرین لێ کراو و چارە ڕەش و دۆزەخی لەپاش دەرکردنی لەبەهەشت دەست دەکات بە هەڕەشە و چاو سور کردنەوە لە ئادەم و نەوەکانی ، ڕاستە (إبلیس) بەهۆی خراپە و خۆبەزل زانی ی خۆیەوە لەبەهەشت دەرکرا و بەر نەفرینی خوای گەورە کەوت ، بەڵام هۆکارەکەی بریتی بوو لەدروست کردنی ئادەم و فەرمان کردن بە کڕنوش بۆ بردنی لەم کاتە(إبلیس)(علیه اللعنة) چەند هەڕەشەیەکی توندو تیژی نواند و سوێندی بەگەورەی و عززەتی خوای گەورە خوارد کە دەبێت بەندەکانت گومڕا و سەرلێ شێواو بکەم و لەلای ڕاست وچەپ و پاش و پێشەوە بۆیان بێم و لەدینی تۆ دەریان بکەم و لەدوا ڕۆژیشدا چارەنوسیان بریتی بێت لە دۆزەخ ، بەڵێ (إبلیس) بەردەوامە لەهەڕەشە و چاو سورکردنەوە لەئادەم و نەوەکانی . بەڵام خوای گەورە مژدە دەدات بە(إبلیس) کە دڵنیا بێت لەدوا ڕۆژ داخۆ شی و سەرجەم شوێن کەوتووانیشی بەرەو دۆزەخ ڕەوانە دەکرێن و دۆزەخیان لێ پڕ دەکرێت ،قورئان دەفەرموێت : ﴿ قال فبما أغويتني لأقعدن لهم صراطك المستقيم ، ثم لأتينهم من بين أيديهم ومن خلفهم وعن أيمانهم وعن شمائلهم ولا تجد أكثرهم شاكرين ، قال أخرج منها مذءوما [1] مدحورا [2] لمن تبعك منهم لأملئن جهنم منكم أجمعين ﴾ (الاعراف: ١٦-١٨) . واتە : ئەی خوایە مادەم لەبەزەیی خۆت دەرت کردم و سەرت لێشێواندم پەیمان بێت کەلەسەر ڕێگە ڕاستەکەی خۆت بۆیان دانیشم پاشان لە ڕوکاری پێشەوە و دواوە و لای ڕاست و چەپەوە بۆیان بێم و گومانیان بۆ دروست بکەم ، تاوای لێ دێ زۆربەی زۆریان سوپاس گوزار نەبن ، خوای گەورەش لەوەڵامدا فەرمووی : ئەی (إبلیس) دەرچۆ لێرە -واتە لەبەهەشت - زۆر بێ نرخی و بێ ڕێزی ، دڵنیاش بە کەدۆزەخ پڕ دەکەم لەو کەسانەی کەشوێن ڕێبازی تۆ دەکەون . هەروەها لە سورەتی (الحجر)دا دەفەرمێت: ﴿ قال ربي بما أغويتني لأزينن لهم في الارض ولأغوينهم أجمعين ﴾ (الحجر: ٣٩). واتە : ئەی پەروەردگارم مادەم سەرت لێ شێواندم بەڵێن بێت کەهەرچی شتە

---

(١) مذءوما : بێ ڕێز (٢) مدحورا: دەرکراو

پیس و ناشرینەکانی سەرزەوییە بۆیان برازێنمەوە پاشان سەر لەهەموویان بشێوێنم ، هەر وەك چۆن تۆ ئەی خوایە سەرت لەمن شێواند ٤ لەسورەتی (ص)دا دەفەرمێت : ﴿ قـال فبعزتـك لأغوينهـم أجمعـين ﴾ (ص: ٨٢) واتە : ئەی خوایە سوێند بێت بەپەروەردگاریتی و عززەتی تۆ هەمویان سەرلێ شێواو و چەواشە بکەم ٤ سەرنج بدە (ابلیس) هەرەشەکە زۆر توندەو لەقسەکانیدا وادەردەکەوێت کەکەس لەبەندەکان ناهێڵێتەوە لەسەر ڕێگەی ڕاستی خوای پەروەردگار و سەرجەم بەکۆ هەمویان گومرا دەکات ، بەڕاستی هەواڵێکی سەیر و ناخۆشە کەواتە دەبێت بەهەشت کێ ی تێ بچێ ؟! تۆبڵێی ئێمەش یەکێ نەبین لەو کەسانەی کەشەیتان سەرمان لێ بشێوێنێ ؟!

پاشان سەیر دەکەین خوای گەورەش پەیمان دەدات و دەفەرمێت پەیمان بێت دەبێت دۆزەختان لێ پڕ بکەم !!

بەڕاستی ئێمەی ئینسان زۆر چارە ڕەش و بێ دەستەلات و لاوازین و تەمەنی ژیانمان لەنێوان ئاگر و ئاسندا بەسەردەبەین چونکە لەدنیادا شەیتان سەرمانلێ دەشێوێنێ و گومڕامان دەکات هەروەك خۆی پەیمانی داوە ، هەروەها لەڕۆژی قیامەتیشدا بەهەمان شێوە لەدوای شەیتانی نەفرین لێ کراوەوە بەرەو دۆزەخ ڕەوانە دەکرێین ؟!

کەواتە ئێستا چی بکەین و سەرلەکێ بدەین و هاوار بۆ کوێ بەرز بکەینەوە و چ هۆکارێك بدۆزینەوە و بەکار بهێنین بۆ دەربازبونمان لەشەیتان ی دنیا و دۆزەخی دواڕۆژمان ؟! ئالەم کاتەدا کەس ناتوانێت وەلامی ئەم پرسیارەمان بداتەوە تەنها ئەو زاتە بەرز و جوان کارەی کەدروستی کردوین کەئەویش ( الله)یە بەڵێ ئەو پەروەردگارە بەرز و خاوەن بەزەییە بێ سنورە بەرامبەر بە دروست کراوەکانی خۆی مژدەدەدا بە مرۆڤەکان و پاشان وەك تیرێکی زۆر ژەهراوی و کاری گەر دای بەسەر دڵی شەیتانداو فەرمووی باش بزانە کەتۆ بڕیار و پەیمانت داوە کەسەرجەم بەندەکانم گومرا بکەیت و وەك خۆت چارەڕەشیان بکەیت ، بەلام دڵنیا بە کەتۆ ناتوانیت ئەو بەندانەم گومرا و چەواشە بکەیت کەبەپاکی بۆمنکاردەکەن و تەنها مەبەستیان ڕازی کردنی منەو هیچی تر .

لەم کاتەدا شەیتانیش دانی نابەم ڕاستیەدا کەچی ئەم هەواڵە بوو و بەهیچ شێوەیەك نەیتوانی بەربەرچی ئەم ڕاستییە بداتەوە هەر بۆیە حەقیقەتی ئەم هەواڵە کاری کردە (إبلیس)و ووتی: ئەی پەروەردگارم سوێند بێت بە عززەت و گەورەیی تۆ کەدەبێت سەرجەم بەندەکانت گومڕا و سەرلێ شێواو بکەم تەنها ئەو بەندانەت نەبێت کەبەدڵ سۆزی تۆ دەپەرستن و کار لەپێناوی دینی تۆدا دەکەن ،هەر وەك دەفەرمێت : ﴿ قال فبعزتك لأغوينهم أجمعين ، إلا عبادك منهم المخلصين ﴾ (ص: ٨٢-٨٣) یان ﴿ لأغوينهم أجمعين إلا عبادك منهم المخلصين ﴾ (حجر: ٣٩-٤٠). بەڵێ ( إخلاص )و بۆ خوا کونجان زۆری بەرهەم هەیە کە إن شاء الله لەدەرس و ئامۆژگاریەکاندا دەچینە خزمەتیان ، وەگەورەترین بەرهەمیشی بریتی یە لەوەی کەشەیتان بەو هەموو فێڵ بازی و ساختە کاریەی خۆیەوە ناتوانێت هەرگیز کار لەیەکێ بکات و گومڕای بکات کەبۆ خوا کار دەکات و(إخلاص)ی تێدایە.

## چەند ئامۆژگاریەکی زۆر گرنگ لەرووداوەکانی بەندی یەکەم

● یەکەمین پەند و ئامۆژکاری لەقۆناغەکانی دروست بوونی ئادەم ئەو ڕاستییەمان بۆ دەسەلمێنێ کە ئێمەش لەکار و فەرمانەکانماندا چەند دەسەلات دارو زانابین ئەوە دەبێت بە پێی یاسای پلە پلە کار بکەین (تدرج) ڕاستیەکی ئاشکرایە لەلای هەموو کەسێکی خاوەن باوەڕ کە خوای گەورە چەند دەسەلات دار و بەهێزە گەر خواستی کارێکی هەبێت بۆ مەبەستی بەئەنجام گەیاندنی ئەوە لە(کن- فیکون) یێکدا ئەنجامی دەدات و هیچ دەسەلاتێکیش لەم بونەوەرەدا ناتوانێت کەبەرگری لەو شتە بکات کە خوای گەورە ویستی وایە کەببێت .

بەڵێ ئەمە لەگەڵ ئەوەشدا کە خوای گەورە زۆر دەسەلات دار و زانایە کەچی زۆریەی زۆری کاروگوفتارە بەرزەکانی بەشێوەیەکی هێواش و پلە پلە (تدرج) ئەنجام دەدات ، کە

دروست کردنی زەوی و ئاسمانەکان لە ماوەی (٦) ڕۆژ و پاشان قەدەغەکردنی ئارەق بە(٣)جار و ، وپاشان دابەزینی قورئان بە(٢٣)ساڵ و دەیان و سەدان ڕوداوی تری لەمانە بەڵگەی پتەو بەهێزن لەسەر ئەو ڕاستیەی سەرەوە کە ئاماژەمان بۆ کرد . کەواتە ئێمەی موسڵمانیش دەبێت لەکار و فەرمان و بانگەواز کردنی خەڵکی و هەوڵدان بۆ فێربونی زانستە ئیسلامیەکان و تێ گەیاندنەوەی خەڵکی دەبێت پلە پلە کار بکەین و لەسەر خۆبین و ئارام گرین و ئەوەندە زانست بدەین بە خەڵکی کەبۆیان هەزم دەکرێت ، وەبۆ سەرجەم شتەکانی تریش بەهەمان شێوە گەر زۆر زیرەك و زاناو تێ گەیشتوش بین و توانای تەواویشمان هەبێت بەسەر ئەو کارەدا .چونکە دەبێت دڵنیا بین لەوە کەئێمەی مرۆڤ نەدەسەڵاتمان بەقەد دەسەڵاتی خوایە ، نەزانستیشمان هاوشێوەی زانستی بێسنوری خوای گەورەیە ، کەواتە گەر خوای گەورە بە(زانست و دەسەڵاتی) بێ سنوری خۆیەوە لەکارو بڕیارەکانیدا یاسای پلە پلە و لەسەر خۆی (تدرج) بەکار بهێنێ دەبێ ئێمەی لاواز و نەزان و بێ دەسەڵات چۆن بڕیار بدەین و کارەکانمان بەڕێوەبەرین ؟!

●پەندی دووەم لەم باسەدا ئەوەمان فێردەکات کەئەگەر ئێمە چەندە زانیاری دار و ژیر بین و زۆر بەی کاتەکانمان لەیاد و پەرستشی خوای گەورەدا سەرف بکەین ئەوە دەبێت دڵنیا بین لەوە کەسانێکی تری غەیری ئێمەش هەن کە زانا ترن لەئێمەو زیاتر شیاوی ئەوەن کە فەزڵیان بدرێت بەسەر ئێمەدا، چونکە لەیاسای بڕیار لەسەر دراوی خوای گەورەدا وایە کەهەرکەسێ زانا تروو لەخوا ترس بێت ئەوە لای خوای گەورە زیاتر شیاوی بەرەو پێش بردن و متمانە پێ کردنە لەبەڕێوەبردنی کارەکاندا .بەڵێ فریشتەکان زانا بوون و خوای گەورە ئەوەندەی زانیاری پێ دابوون کەبەهۆیەوە زیاتر بێ پەرستن ، بەلام ئادەم (علیه السلام) زیاتر لە (فریشتەکان) زانیاری پێدرا و لەپێش تر بوو بۆ کاری جێ نشینی کاتێ فریشتەکان ئەم ڕاستیەیان زانی دەستبەجێ و بەیەك دەنگ فەرموویان : ﴿ سبحانك لاعلم لنا إلا ما علمتنا إنك أنت السميع العليم ﴾ واتە : پاك و بێ گەردی بۆ تۆ ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی ئێمە هیچ زانست و زانیاریەکمان نیە تەنها ئەوەندە نەبێت کەتۆ

فێرت کردوین بەڕاستی تۆ بیسەر و زانای .بەڵێ ئەوە سیفەتی بەرز و ئاکاری جوانە کاتێ یەکێکمان بینی کەلەخۆمان زیاتر زاناو تێ گەیشتووە دەست بەجێ دروشمی پاك و بێ گەردی بۆ پەروەردگارمان بەرز بکەینەوە و پاشان دان بەزیرەکی و لێ هاتووی ئەو کەسە دابنێین چونکە خوای گەورە دەفەرمێت: ﴿ وفوق كل ذي علم عليم ﴾.. واتە : لەسەرو هەموو زانایەکەوە زاناترێکی تر هەیە . یان دەفەرمێت: ﴿ يرفع الله الذين آمنوا والذين أوتوا العلم درجات ﴾ .واتە: خوای گەورە باوەڕداران و خاوەن زانستەکانی بەچەند پلەیەك بەرز کردۆتەوە بەسەر خەڵکانی تردا . گومانی تێدا نیە کەهەر کەسێ زاناتر بێت ئەوە دەبێت ئەو کەسە بکرێتە فەرمان ڕەواو ئاوەدان خوازی سەر زەوی ، چونکە کەسی زانا دەزانێ کە چۆن زەوی ئاوەدان بکاتەوە و کارەکان بەڕێوەبەرێت نەك کەسی نەزان و بێ زانیاری ، گەورە ترین زاناش ئەو کەسەیە کەپەروەردگاری بەڕاستی بناسێ و بەپێ ی یاسای ئەو کاربکات نەك بەهەواو ئارەزوی خۆی ، بەڵێ هەر بۆیە خوای گەورە زانیاری کردە پێوەرێك و فەزڵی ئادەمی دا بەسەر فریشتەکاندا. بەڵام بەداخەوە ئەمڕۆ لەدنیادا کار و بەڕێ وبەرایەتی دراوە بەچەند کەسانێك کەخاوەنی زانیاری نین و پەروەردگاریان ناناسن کەئەنجامی ئەم کارە ئەم هەڵانەی لێ کەوتۆتەوە.

(أ) نەمانی زانست و زۆربونی نەفامی کەمەش بەهۆی فەرمان دان بەکەسی نەفام و دورخستنەوەی خاوەن پیشە و زانایان لەکاری فەرمان ڕەوای ، کەئەمەش یەکێکە لەنیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژەی بۆ کردووە کەدەفەرمێت ((من أشراط الساعة أن يرفع العلم ويثبت الجهل))[1] واتە : یەکێ لەنیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی بریتیە لەنەمان و بەرزبونەوەی علم و جێگیربوونی نەفامی و (جهل) .

(ب) زۆربونی فەساد و بەدکاری : ئەمیش لەکاتێکدا کەخەڵکی لەدینی خوای گەورە بەدورین و کەسانی دور لەزانست و شیاو بۆ کاری فەرمان ڕەوایی ببنە ئاغاو دەسەڵات دار لەو شوێنەدا هەر وەك خوای گەورە دەفەرمێت: ﴿ الذين طغوا في البلاد فأكثروا فيها الفساد ﴾. بەڵێ بەشێوەیەکی گشتی کاتێ کەسانی زانا و خواناس دەسەڵات دار و لێ

---

(١) (رواه البخاري و مسلم)

پرسراو بوون ئەوە (دادپەروەری و ڕەوشت بەرزی وخواناسی و دەست پاکی و هەرزانی و یارمەتی دانی یەکتری و...هتد) بلاّو دەبێتەوە ، بەلاّم بەپێچەوانەشەوە هەر کاتێ کەسانی نەزان و نەشیاو بوون بەجێگیر و لێ پرسراوی سەرزەوی ئەوە ( ستەم و بەدکاری و دەست پیسی و درۆ و بێ باوەڕی و قات و قڕی و گرانی و کوشت و کوشتار ) بلاّو دەبێتەوە ، هەروەك سەر زەویی ئەمڕۆ بەو حالّەتەدا تێ پەڕدەبێ .

●پەندی سێیەم خوای گەورە بەفریشتەکانی فەرموو: ﴿ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً ﴾ واتە: من دەمەوێت کەجێ نشینێ لەسەر زەویدا جێ گیر بکەم ! ! ئالێرەدا چەند پرسیارێك دروست دەبێت : ئایا بەشێوەیەکی گشتی هەموو مرۆڤەکان جێ نشینی خوای گەورەن لەسەر زەویدا ؟! ئایامانای جێ نشینی چی دەگەیەنێت ؟! ئایا بەکێ دەوترێت جێ نشین ؟! وەدەیان پرسیاری تری لەم جۆرە، ئایا مرۆڤە بێ باوەڕو وخوانەناس و دووڕوەکان جێ نشینی خوای گەورەن لەسەر زەویدا ؟!

لەوەلاّمدا دەلّێین نەخێر چونکە کاری جێ نشینی زۆر لەوە گەورەترە کە هەندێ خەلّکی سادەو نەفام لێ ی تێ گەیشتون و حسابی بۆ دەکەن . کەسێ جێ نشینی خوای گەورەیە لەسەر زەویدا کەبەپێ ی یاساکانی بجولّێتەوە و کاریکات و لەخۆی و خەلّکانی ژێر دەسەلاّتیدا دینی خوای گەورە جێ بەجێ بکات نەك پشت بکاتەیاساکانی پەروەردگار و دژایەتیی بکات و خەلّکی لێ دور بخاتەوە . بەلّێ لەدنیای خۆشماندا هەروایە کەیەکێ بەجێ نشینی بەڕێوبەر و دەسەلاّت دارێك دادەنرێت کەبەفەرمانەکانی هەلّسێ و کارەکانی راپەڕێنێ نەك کەسێ پشت لەیاسای گەورەکەی بکات و دژایەتی بکات . بەپێ ی ئەم یاسایەی سەرەوە دەتوانین وەلاّمی سەرجەم ئەو پرسیارانە بدەینەوە کەلەسەرەتادا کردمان کەئەویش بریتیە لە: ئەو کەسانە شەرفی جێ نشینی و ئاوەدان کردنەوەی زەوی یان پێ سپێردراوە کەباوەڕدار و لەخوا ترسن و بەدینی خوای گەورە کاردەکەن و یاسا و ئامۆژگاریەکانی پەروەردگاریان بلاّو دەکەنەوە بۆ مەبەستی جێ بەجێ کردنی بەهەمان شێوەش ئەو کەسانەی کەپشتیان لە یاساو ئامۆژگاریەکانی خوای گەورە کردووە و دژایەتی

خوای گەورە و پێغەمبەر و باوەڕداران دەکەن هەرگیز بۆ کاری جێ نشینی ناگونجێن و پێیان ناوترێت بەندەی خوا بەڵکو ئەوانە بەندەی (ابلیس) و سەربازی گوێڕایەڵی ژێر دەستی شەیتانن و خوای گەورە دەربارەیان دەفەرمێت: ﴿ أولئك كالانعام بل هم إضل﴾ واتە: بەڕاستی ئەوانە وەك ئاژەڵ وان و بگرە سەرلێ شێواو تریشن . کەواتە:

**کەسێ جێ نشینە کەبەقسەی گەورەکەی بکات**

**نەك دژی بووەستێ و پشتی تێ بکات**

●پەندی چوارەم پاش ئەوەی خوای گەورە ئادەمی دروست کرد و لەبەر خۆردا داینا تا ووشك بویەوە و پاشان ڕوحی کرد بەبەریدا هەروەك دەفەرمێت : ﴿ ونفخت فيه من روحي ﴾ (ص : ٧) واتە : لەپاشاندا ڕوحمان کرد بەبەریدا !

بەڵێ ڕوح ئەو خەڵاتە پیرۆزەیە کە لاشە مردووەکان زیندو دەکاتەوە و پەروەردگاریان پێ دەناسێنێ ، ڕوح یەکێکە لەو نعمەتە گەورە و پیرۆزانەی کە لەهەر لاشەیەکدا بێتەبەرێزی دەکات و بۆنی خۆش دەکات ، ڕوح یەکێکە لەهەرە ئەو دیاریە بەنرخانەی کە مرۆڤەکان لەدنیای ماددی بێ بایەخەوە هەڵدەگرێ و بەرەو جیهانی باوەڕبوون بە خوا و فریشتەکان و ڕۆژی دوایی و سەرجەم لایەنە نادیار و غەیرە ماددیەکان دەبات و مرۆڤەکان بەواتا پێ ی دەبنە مرۆڤ و لەیاسا و قاڵبە ئاژەڵیەکەیان دەردەچن و ڕزگاریان دەبێت .

گەر سەرنجی قورئان بدەین دەربارەی هەموو ئەو شتانەی کەباسی کردووە لەگەڵیدا ڕون کردنەوەیەکی سەر بەخۆ و دوور و درێژ و چڕ و پڕی لەبارەوە کردووە بۆ نمونە ( ژیانی دنیا ، بەهەشت و نعمەتەکانی . دۆزەخ و سزاکانی . نیشانەکانی ڕۆژی دوایی . ناو و سیفەتەکانی خوای گەورە . باسی تەلاق و ژن هێنان . میراتی بەش کردن . بەسەرهاتی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) بەسەر هاتی ئەو گەل و نەتەوانەی کەلەپێش ئیسلامدا هەبوون . باسی حوکم و فەرمان ڕەوایی . باسی مردن و ئەجەلی ئینسان . باسی حەلاڵ و حەرام . باسی عەقیدە و بەشەکانی . سیفەتی باوەڕداران و پلەکانی . سیفەتی دووڕو و بێ

باوەڕەکان، باسی جیهادوو تێکۆشان . باسی ماڵ بەخشین و سەدان و هەزاران . باسی جۆراو جۆری تری لەم بابەتە لەقورئان و فەرموودەی پێغەمبەردا باسیان لێ کراوە ، بەڵام تەنها شتێ کەلەقورئان و سوننەتدا بە دوور و درێژی و چڕو پڕی باسی لێوە نەکرا بێ (ڕوح)ە بەڵێ پرسیار کردن دەربارەی ڕوح شتێکی تازە نی یە و هەرکاتێ خۆی پرسیار لە پێغەمبەر کرا لەبارەیەوە و خوای گەورەش وەڵامی دانەوە و فەرمووی: ﴿ قل الروح من أمر ربي وما أوتيتم من العلم إلا قليلا ﴾ واتە : ئەی محمد پرسیاریان لێ کردی دەربارەی (ڕوح) تۆش بڵێ ڕوح تەنها شتێکە پەیوەندی بەپەروەردگارمەوە هەیە و لەو بارەیەوە کەمێك زانیاریمان پێ دراوە. بەڵێ ڕوح جیهانێکی سەربەخۆیەو کەس تائێستاو تا ڕۆژی دوایش ناتوانێت زانیاری تەواوی تیا بەدەست بهێنێ ، چونکە (ڕوح) تەنها شتێکە کە تەنها خوای پەروەردگار حەقیقەت و زانیاری بێ سنوری دەربارەی هەیە و دەزانێ چیە و چۆنە . وەهەموو ئەو کەسانەی کەئەمڕۆ دروست بوون و بانگەشەی ئەوە دەکەن کەدەتوانن (ڕوح)ی مردو ئامادە بکەن و قسەی لەگەڵدا بکەن بە ناوی (تحذير ارواح) هەمووی درۆیە و چاوبەست کردن و چەواشە کردنی خەڵکە و ئەوەی ئەوان دەی کەن پەیوەندی بەجیهانی (جنۆکە و شەیتانەکانەوە هەیە)و هیچی تر (١).

● پەندی پێنجەم بەڕاستی خوای گەورە کاتێ ئادەمی دروست کرد هەروا وەك دروست کراوێکی بێ ڕێز دای نەناو ئیهمالی نەکرد بەڵکو خوای گەورە،گەورە ترین ڕێزی خۆی لەئادەم و نەوەکانی گرت بەم شێوەیەی خوارەوە .

(أ) دروست کردنی ئادەم بۆ مەبەستی کاری جێ نشینی خۆی گەورەترین ڕێزی پەروەردگار بوو بۆ ئادەم و نەوەکانی تاڕۆژی دوایی .

چونکە خوای گەورە ئادەمی لەناو سەرجەم دروست کراوەکانی خۆیدا هەڵبژاردو ئەم شەرەفە گەورەیەی پێ خەڵات کرد بەتایبەتی لەناو مەلائکەتەکاندا کەئاشکرایە مەلائکەت نەفسیان نیەو هەرگیز بیر لەتاوان ناکەنەوە و بەردەوام لەگوێ ڕایەڵی پەروەردگاریان دان ،

(١) عالم الجن والشياطين ، د . عمر سليمان الاشقر ( ص: ١٠٠)

بەڵام خوای گەورە دەیەوێت ئەو ڕێزە وەك مەدالیایەکی زۆر بەنرخ بکاتە ملی ئادەم و نەوەکانی و زیاتر پێ ی بەڕێزبن.

(ب) دووەم ڕێزی خوای گەورە بۆ ئادەم نەوەکانی بریتیە لەفێرکردنی زانست و زانیاری کەفەرموویەتی: ﴿ وعلم آدم الأسماء كلـها ﴾ واتە: زانیاری ئەواومان بەخشی بەئادەم لەبارەی ناوی هەموو شتەکانی سەر زەویەوە ، یان دەفەرمێت: ﴿ علم الانسان مالم يعلـم ﴾ واتە : زانستمان دا مرۆڤەکان لەکاتێکدا زانستیان نەبوو.

بەڵێ خوای گەورە بۆ سەلماندنی زانیاری و کارزانی خۆی یەکەمین بەڵگە بەکاری هێنا بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستیە بریتی بوو لە ڕوو بەڕوو کردنەوەی ئادەم و فریشتەکان ئەویش بەوەی کەبەفریشتەکانی فەرموو: ﴿ أنبئوني بأسماء هؤلاء إن كنتم صـادقين ﴾ واتە : گەر ڕاست دەکەن و دەڵێن ئێمە شیاوترین لەئادەم بۆ کاری جێ نشینی لەسەر زەویدا ناوی ئەم شتانەم پێ بڵێن ؟! فریشـتەکانیش لـەوەڵامدا وتیـان : پـاك و بێگـەردی بۆتـۆ ئـەی پەروەردگارمان ئێمە ئەوەندە دەزانین کە تۆ فێرت کردوین و لەوە زیاتر زانیاریمان نیە .

(ج) سێ هەم ڕێزی پەروەردگار بۆ بەندەکانی بریتیە لەوەی کە لەگەڵ پێ بەخشینی زانست و زانیاری دا نعمەتی ڕوون کردنەوە و تێ گەیاندنی ڕوداوەکـان و سەرجەم شتەکانی تری سەرزەوی پێ د اوە .

بەڵێ تەنها زانیـاری بەس نییە بۆ مرۆڤ بەڵکو لەگەڵ ئـەو زانیاریەشـدا پێویسـتە کەتوانای هەبێت ڕوداوەکـان شـی بکاتـەوە دەستەڵاتی ئـەوەی هەبێت کە ئـەو زانیاریـە لەخەڵکی تێ بگەیەنێ ، گەر نا ئەوە ئەو زانیاریە هیچ سودێکی نیە و وەك زانیـاری ئـاژەڵانی لێ دێ ، بۆنمونە: گەر دەرمانێکی ژەهراوی بۆ مێشێك دابنێیت بۆ مەبەستی لەناوبردنی پاش ماوەیەك سەریدەیتەوە دەبینیت کەوا چەند مێشێکی کوشتووە ئاشکراشە کەئەم مێشانە هەمووی بەیەك جار نەمردوون بەڵکو یەك لەدوای یەك هاتوون بەسەر ئەو دەرمانـە ژەهراویـە وە نشتونەتەوە و هەر یەکەیان لاشەی ئـەوی تریـانی دیوە کەمردار بوتـەوە ، گەر لێرەدا سەرنجێك بدەین ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێت کە مێشی دووەم زانی کەوا مێشی یەکەم

بەم دەرمانە ژەهراویە مردووە بەڵام ئەو نعمەتەی پێنەدراوە کەبچێت رونی بکاتەوە بۆ سەرجەم مێشەکانی تر کەنزیکی ئەو دەرمانە نەکەونەوە چونکە دەتان کوژێ و وەك ئەو مێشەتان لێدەکات کەئێستا مردووە بەهۆی ئەو ژەهرەوە ، هەر بۆیە دانەدانە بەسەر ئەو دەرمانەوە دەنیشنەوە و بەجارێك ژمارەیەکی زۆریان لێ دەمرێ . قورئان لەم بارەوە دەفەرمێت: ﴿ علمه البيـــان ﴾ واتە : مرۆڤەکانمان فێری ڕون کردنەوەی مەسەلەکان کردووە.

(د) چوارەمین ڕێزێ خوای گەورە بۆ مرۆڤەکان ئەوەیە کەئەم بونەوەرە گەورە و جواز کارەی لەخزمەتی ئینسان دا دروست کردووە و سەرجەم دروست کراوەکانی خوای گەورە بۆ ئینسان مل کەچەو لەخزمەتی ئینساندایە هەروەك خوای گەورە دەفەرمێت: ﴿ وسخر لكم مافي السموات ومافي الارض جميعا منه ﴾

واتە : ئەوەی لەزەوی و ئاسمانەکان دایە بۆ سەرجەم مرۆڤەکانم مل کەچ کردووە بەو واتایەی هەر لە (مێرولەیەکەوە تا دەگاتە خۆر و دروست کراوەکانی تریش) سەرجەم بەکۆ لەخزمەتی ئینسانەکاندان.

(و) پێنجەمین ڕێزی پەروەردگار بۆ مرۆڤەکان بریتی بوو لەوەی کەفەرمانی بە (پەری و فریشتەکان کرد کەکڕنوش ببەن بۆ ئادەم) کەئەمەش ڕێزێکی زۆر گەورە بوو بۆ ئادەم و پاشان بۆ نەوەکانی دوای خۆشی ، بەڵام کڕنوش بردنی ڕێز نەك کڕنوش بردنی عبادەت ! !

● پەندی شەشەم گەورەترین نەخۆشی کەتوشی مرۆڤەکانی ئەمڕۆ بووە بریتیە لەخۆ بەزل زانی (تكبر) کەبەهۆیەوە ئینسانەکان لەڕەحمی خوای گەورە دەردەکرێن و ئەمان لەشوێنی خۆیانەوە چەندە خۆبەزل زان بن بەڵام لای خوای گەورە ئەوەندە سوك و بێ ڕێزن و دەرکراو و بێبەشن لەلێ خۆش بون و بەزەیی خوایی ، بەڵێ گەورەترین خاڵێك کەبووە هۆی دەرکردن و ڕسوای شەیتان تا ڕۆژی دوایی ، نەخۆشی خۆبەزل زانین بوو ئەویش لەکاتێکدا بوو کەخوای گەورە فەرمانی کرد بە کڕنووش بردنیان بۆ ئادەم بەڵام (إبلیس) بەتەنها بەرپەرچی فەرمانی خوای گەورەی دایەوە ، خۆی بەزل زانی نەبەردەم ئەم فەرمان

بێ کردنەدا هەروەك خوای گەورە دەفەرمێت: ﴿ أبى واستكبر ﴾ واتە: ڕەفزی کرد و خۆی بەزل زانی. پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەفەرموودەیەکی شیرین دا وەسفی خۆبەزل زانینمان بۆ دەکات و دەفەرمێت: ((الكبر بطر الحق وغمط الناس)) واتە : خۆبەزل زانی بریتیە لە بەرپەرچ دانەوەی ڕاستی و بێ ڕێز سەیر کردنی خەڵکی . شەیتان ئەم دوو سیفەتەی تێدابوو کەلەجاری یەکەم دا ئەو فەرمانە ڕاستەی لای پەروەردگار یەوە دابەزیبو شکاندی وپاشان زۆر بەبێ ڕێزی سەیری ئادەمی کردوو فەزڵی خۆی دابەسەر ئادەمدا بەبەڵگەی ئەوەی کەئەم -واتە شەیتان- لەئاگر دروست کراوە و ئادەمیش لەقوڕ . هەروەك قورئان دەفەرمێت: ﴿ قال أنا خيرا منه خلقتني من نار وخلقته من طين ﴾ (الاعراف:١٢). گەر سەرنجێکی قورئان بدەین ئەوە دەبینین کەتۆڵەی هەندێ تاوان لەدنیادا نیەو خوای گەورە لەدواڕۆژدا سزای ئەو تاوان بارانە دەداتەوە، بەڵام تۆڵەی خۆبەزل زانی دەست بەجێ لەدنیادایە و پاشان سزا سەختەکەشی بۆ ڕۆژی دوایی هەڵگیراوە ، لەدنیادا بریتیە لە سوك بوون و ڕسوایی و دەرچون و بێ بەش بوون لەڕەحمەتی خوای گەورە ، هەروەك شەیتان ئەم خەڵاتەی لەشوێنی خۆیدا وەرگرت کەقورئان ئاماژەی بۆ دەکات و دەفەرمێت: ﴿ قال فاهبط منها فما يكون لك أن تتكبر فيها فاخرج إنك من الصاغرين ﴾ (الاعراف: ١٣). واتە هەڵبسە لێرەدا - واتە لەبەهەشت - چونکە ڕێنەدراوە بەتۆ کەلەم شوێنەدا خۆت بەزل بزانی و تۆ یەکێکی لەبچوك و بێ ڕێزەکان . باس کردن و ڕاڤەکردنی ئەم بەسەرهاتە تەنها هەڵدانەوەی لاپەڕەیەکی مێژووی نیە و بەس ، یان ئەم سزایە تەنها تایبەت نیە بە(ابلیس)ەوە بەڵکو سزایەکی گشتی یە بۆ هەموو ئەو کەسانەی کەڕێبازی شەیتان دەگرنەوە و لەسەر ڕێبازی ئەو دەڕۆن و خۆیان بەگەورە دەزانن ، نەخۆشی خۆبەزل زانی یەکەمین هۆکارێك بووە بۆ بەرپەرچ دانەوەی دینی خوا و ئامۆژگاریە ڕاست و دروستەکان لەهەموو سەردەمێکدا بەدرێژای مێژوو ، هەر وەك لەقورئاندا باس لەم حاڵەتە زۆر کراوە ، لەبارەی گەلەکەی (شعیب)(علیه السلام) دەفەرمێت: ﴿ قال الملأ الذين استكبروا من قومه لنخرجنك ياشعيب...... ﴾ (الاعراف: ٨٨) واتە : ئەو کەسە خۆبەزل زان و دەسەڵات دارانەی

گەلەکەی (شعیب) ووتیان ئەی (شعیب) تۆو سەرجەم ئەو کەسانەی کە باوەڕیان پێ هێناویت دەرت دەکەین لەم وولاتەی خۆمان ......) یان لەبارەی خۆ بەزل زانەکانی گەلەکەی (صالح)ەوە دەفەرمێت: ﴿ قال الملأ الذين استكبروا من قومه للذين استضعفوا لمن آمن منهم أتعلمون أن صالحا مرسل من ربه ، قالوا إنا بما أرسل به مؤمنون ، قال الذين استكبروا إنا بالذي آمنتم به كافرون ﴾ (الاعراف: ٧٥-٧٦) واتە : دەستەلات دار و خۆبەزل زانەکانی گەلەکەی (صالح) ووتیان بە کەسە بێ دەسەلات و هەژارەکان ی کەباوەڕیان هێنابوو : ئایا ئێوە دەزانن کە(صالح) لەلایەن خواوە هاتووە و نێردراوە ؟! باوەڕدارە بێ دەستەلاتەکان لەوەلامدا ووتیان ئێمەباوەڕمان هێناوە بەوەی کە(صالح) وەك پێغەمبەرێك بانگی خەلکی بۆ دەکات . دیسانەوە دەسەلات دار و خۆبەزل زانەکان ووتیان ئێمە بێ باوەڕین بەوەی کە ئێوە باوەڕتان پێ هێناوە . گەر سەرنجێکی ئەم دوو ئایەتە و سەرجەم ئایەتەکانی تری قورئان بدەن ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێت کەتاکە هۆکارێك لەبەردەم پشت کردنە فەرمانی پەروەردگار و بانگەوازی پێغەمبەران بریتی بووە لەنەخۆشی خۆبەزل زانی ، بەلێ ئەم کەسانە کەباوەڕیان نەهێنا بەپێغەمبەران و دژیان وەستان لەبەر ئەوە نەبووە کە ( دەولەمەند بوون یان قۆز بوون و خاوەنی جوانیەکی بێ سنور بوون یان خاوەنی عەقل و ژیریەکی کەم وێنەبوون یان مال و مندالیان زۆر بووە ) بەلکو تەنها هۆکارێك لەم مەسەلەیەدا بریتی بووە لەخۆبەزل زانی . هەربۆیە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمێت: ((لايدخل الجنة أحد في قلبه مثقال ذرة من كبر)) واتە : هەرکەسێ بەقەدەر گەردیلەیەکی زۆر بچوك گەر خۆ بەزل زانی لەدلیدا بێت ناچێتە بەهەشتەوە .

● پەندی حەوتەم/گەورەترین هەلەو تاوان کە إبليس ئەنجامی دا بریتی بوو لەوەی کە ووتی ئەی خوایە مادەم گومرات کردم هەروەك دەفەرموێت : ﴿ قال بما أغويتني ﴾ إبن عباس لەتەفسیری ووشەی (أغويتني)دا دەفەرموێت: ﴿ كما أظللتني ﴾.. واتە : ئەی خودایە تۆ گومرات کردم ووەی ڕاستت لێ وون کردم ؟! بەراستی تاوانەو گەورەترین بێ شەرمی یە گەر

ئێمە بەویستی خۆمان هەڵبسین بەئـەنجام دانـی خراپـە وتـاوانێك وپاشـان بلێـین خـوا پـێی کردین ؟! یان خوا ڕقی لەمنەو گومرای کردم کاتێ ئـەو تاوانـەم ئـەنجام دا ، چونکـە خـوای گەورە هەرگیز فەرمان بەخراپە ناکات هەروەك دەفەرمێت: ﴿ إن الله لايأمر بالفحشـــاء ﴾ واتە : هەرگیز خوای گەورە فەرمان بەخراپـەکاری ناکـات و هـەرگیز خواسـت ی ئـەوەی نیـە کەبەندەکانی گومڕاو سەرپێچی خوازین .

●پەندی هەشتەم/پاش دەرکردنی شەیتان لەبەهەشت و ناز و نعمـەت و ڕەحمـی خـوای گەورە جەنگ لەنێوان ئادەمی و شەیتاندا دروست بوو ئەویش بەوەی کەشـەیتان هەڕەشـەی کرد و ووتی: ﴿ لأقعدن لهم صراطك المستقيم ﴾ واتە : بەڵێن بێـت لەسـەر ڕێگاڕاسـتەکەی تۆ بۆیان دابنیشم ، ئەویش بۆ مەبەسـتی گومـڕا کـردن و چەواشـە کردنیـان و بـەرەو دۆزەخ بردنیان و دورخستنەوەیان لە سۆز و بەهەشتی تۆ ، هەروەك پێغەمبـەر ( ﷺ ) لـەم بـارەوە دەفەرمێت: ((إن الشيطان قعد لأبن آدم بطريقه فقعـد لـه بطريـق الاسلام فقـال أتسلم وتـذر دينك و دين آبائك ؟ قال فعاصه فأسلم ، قال ((وقعـد لـه بطريـق الهجـرة فقـال أتـهاجر وتـدع أرضك وسمائك وإنما مثل الهاجر كالفرس في الطول فعصاه وهاجر ثـم قعد لـه بطريـق الجهاد وهو جهاد النفس والمال فقال تقاتل فتقتل فتنكح المرأة ويقسم المـال قـال فعصـاه وجـاهد)) وقال رسول الله (ﷺ) ((فمن فعل ذلك منهم فمات كان حقا على الله أن يدخله الجنـة وإن قتـل كان حقا على الله أن يدخله الجنة وإن غرق كان حقا على الله أن يدخله الجنـة أو وقصتـه دابـة كان حقا على الله أن يدخله الجنة)) (رواه الامام أحمد -تفسير ابن كثير ج٢ ص٢٠٤) واتـە : شـەیتان لەسـەر ڕێگاکانی ئینسـان دادەنیشـێ و یەکـەم ڕێگایـەك کەلەسـەری دانیشـتبێ ڕێگـای موسوڵمان بوونە و پـێ ی دەڵـێ : ئایا موسوڵمان دەبی و واز لـەدینی باوباپـیرت دەهێنیـت ، پاشـان ئـەوبەندەیـەی کەخواسـتی موسـوڵمان بوونـی هەیـە و دەیـەوێت موسـوڵمان بێـت سەرپێچی لەم گومان و وەسوەسەی شەیتان دەکات و موسوڵمان دەبێـت ، پاشـان شـەیتان لەسەر ڕێگای کۆچ کردن (هجـرة) بـۆ ئـەو بەندەیـە دادەنیشـێ و پـێ ی دەڵـێ : ئـەوە کۆچ

دەکەیت و خاك و ئاسمانی وولاتی خۆت بەجێ دەهێڵی ؟! بەلام بۆ جاری دووەم ئەم کەسە کۆچ کەرە لەبەر خوای گەورە گوێ بە وەسوەسەی شەیتان نادات و زۆر گورج و گۆڵ و ئازایانە کۆچ دەکات ، پاشان شەیتان لەسەر ڕێگای جیهاد و تێ کۆشانی نەفس و بەخشینی ماڵدا بۆ مرۆڤەکان دادەنیشێ و بەو کەسە دەڵێ : تۆ دەجەنگی بەلام پاشان دەتکوژن و لەپاش مردنی تۆ ژنەکەت مارەدەکەنەوە خەڵکانی تر سەروەت و سامانت وەك میراتی بەش بەش دەکەن سەرەنجام لەمیشیاندا ئەو کەسە بەقسەی شەیتان ناکات و دەجەنگێ)

پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((هەرکەسێ ئەم کارانەی ئەنجام داو مرد ئەوە خوای گەورە بەفەزل و ڕەحمی خۆی لەسەر خۆی پێویست دەکات کەبیخاتە بەهەشتەوە ،هەرکەسێ لەم ڕێگایانەدا کوژرا ئەوە پێویستە لەسەر خوای گەورە کەبیخاتە بەهەشتەوە ، هەرکەسێ لەم ڕێگەدا مرد ئەوە پێویستە لەسەر خوای گەورە کەبیخاتە بەهەشتەوە ، هەرکەسێ لەسواری ئاژەڵەکەی کەوتە خوارەوە و مرد ئەوە پێویستە لەسەر خوای گەورە کەبیخاتە بەهەشتەوە . بەڵێ سەرەکی ترین کاری شەیتان بریتیە لەدروست کردنی وەسوەسە و دڵە ڕاوکێ بۆ ئەو کەسانەی کەڕێ ی ڕاستیان گرتووە و تەنها (الله)بە پەروەردگاری خۆیان دەزانن و ئیسلام بەڕێگەی ڕاستی خۆیان دەزانن .

پاشان خاڵێکی زۆر گەورە تر لەمە ئەوەیە کە شەیتان بەزمانی حاڵی خۆی دان دەنێت بەڕێگەی ڕاستی پەروردگاردا ﴿ صراط المستقیم ﴾ چونکە دڵنیایە لەوەی کەتەنها ڕێگایەکی ڕاست کەمرۆڤەکان لەدنیادا لەسەری برۆن و لەدواڕۆژیشدا بەرەو ڕازی بوونی خواو بەهەشتی فردەوسیان بەرێت ئەوە ڕێگە ڕاستەکەی خوای گەورەیە کەبە ﴿ صراط المستقیم ﴾ ناو براوە . جائەگەر یەکێ پرسیار بکات و بڵێ : باشە ئێمە کاتێ خوای گەورە هیدایەتی داوین و لەسەر ڕێگە ڕاستەکەی ئەوین ئیتر چ پێویست دەکات کە ڕۆژی (١٧) جار بەلایەنی کەمەوە بڵێین ﴿إهدنا الصراط المستقیم ﴾ ؟!

لەوەلامدا دەڵێین :

أ) ناسینی رێگەی راست لەلایەن مرۆڤەکانەوە تەنها رێگەیەك نیە بۆ دەرباز بوون لەدۆزەخ و چونە ناو بەهەشتەوە چونکە گەروا بێت ئەوە دەبێت شەیتان لە پێش هەموو کەسێکەوە بچێتە بەهەشتەوە و لەدۆزەخ ورقی خوایی رزگاری بێت ، چونکە ئاشکرایە کاتێ(شیطان) زانیاری بە(صراط المستقیم) بوو ئادەم و ئەوەکانی بوونیان لەهیچ جێگایەکدا نەبوو کەواتە بەپێی ئەم یاسایەی سەرەوە ئێمەی مسوڵمان تەنها بەوە رزگارمان نابێت کەشارەزاییمان هەبێت کە (صراط المستقیم) رێگەی راستی خوایە.

بەڵکو دەبێت لەگەڵ ئەو زانینەشدا شوێنی بکەوین وخەڵکانی تری بۆ بانگ بکەین وخەڵکی لەبانگەشەی چەواشەکاری وبیردۆزو رێگە شەیطانیە دۆزەخیەکان دوربخەینەوە.

ب) بەردەوامی و کۆڵ نەدان لەسەر ئەو رێگە راستە خاڵێکی تری گرنگی کاری ئێمەیە بۆ نەپچرانمان لەرەزامەندی خوای گەورەو بەدەست هێنانی بەهەشت.

بەڵێ لەنوێژەکانماندا دەڵێین: (إهدنا الصراط المستقیم) مانای ئەوە دەگەیەنێت کە ئەی پەروەردگارم وەکو رێر راست و پاکت نیشان داوم بەردەوامم بکە لەسەری تا دەمرم .

بەراستی سیفەتی بەردەوامی یەکێکە لەهەرە ئەو رێگە نزیکانەی کەمرۆڤەکان دەگەیەنێتە مەنزڵ و مەبەست (کافر بێت یان مسوڵمان).

هەر ئەم سیفەتی بەردەوامیە بوو کەوای لەپێغەمبەر کردوو پیری کرد هەروەك خۆی دەفەرموێت: ((شیبتنی هود وأخواتها)) واتە : هودو خوشکەکانی پیریان کردم ،ئەویش ئەم ئایەتەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فاستقم كما أمــرت ﴾ واتە : بەردەوام بە لەسەر ئەوەی کە فەرمانت پێ کراوە.

بەڵێ بەرهەمی بەردەوامی بریتیە لەرازی کردنی خوای گەورە، گەیشتن بەئاوات و مەبەستی خۆت لەدنیاو دوارۆژدا ، بەدەست هێنانی بەهەشت ، سەرکەوتن بەسەر شەیتان و شوێن کەوتوانیدا.

ج) وتنی (صراط المستقیم) تەنها لەدنیادا ماناکەی تەواو نابێت بەڵکو پەیوەندیەکی زۆر گەورەشی لەگەڵ ژیانی دوارۆژدا هەیە ئەویش بەوەی کە خەڵکی دەبینی کەوا لەتاو

سزای خوا وەك سەرخۆشیان لێ هاتووە وهەندێکیان غەرقی ئارەق بوون وهەندێکی تر بەرچاوی تۆوە لە سەر سەر بەدەم وچاو رادەکێشرێن وپاشان هەڵدەدرێنە دۆزەخەوە بەڵام خاوەنی ووتەی (صراط المستقیم) لەوخەڵکە جیادەکرێنەوەزۆر بەرێزەوە دەکرێنە ژێر سێبەری عەرشی پەروەردگاریانەوە و پاشان لەدوای پێغەمبەران وراست گۆو شەهیدو پیاوچاکانەوە دەرگاکانی بەهەشتیان بۆ دەخرێتە سەر پشت وپێیان دەوترێت (سلام علیکم بما صبرتم) سەلامی پەروەردگارتان لێ بێ لەسەر ئەوەی لەدنیادا ئارامتان گرت و بەردەوام بوون لەسەر رێگەی راست و هەڵبژاردنی (صراط المستقیم).

● پەندی نۆیەم/شەیطان لەکاتی هەرەشەکانی دا چوار رێگەی دیاری کرد کە مرۆڤەکانی لێوە گومرا بکات هەروەك قورئان دەفەرموێت : ( لآتینهم من بین ایدیهم ومن خلفهم وعن ایمانهم وعن شمائلهم ) (الأعراف: ١٦) (إبن عباس) لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت:

أ- ﴿ ثم لآتینهم من بین أیدیهم ﴾ أشککهم فی آخرتهم : واتە کاتێ شەیطان لە روکای پێشەوە دێت بۆ مرۆڤەکان وەسوەسەی ئەوە دەخاتە دڵیانەوە کە گومان لەهاتنی دوا رۆژدا دورست ببێت لەبیروباوەرەکەیاندا .

بەراستی شەیطان بەڵێنی خۆی بردە سەر وو بەدرێژایی مێژوو دەیان و سەدان هەزار کەسی وا لێکرد کەگومانیان بۆ دروست ببێت بەرامبەر بەزیندووبوونەوە و هاتنی رۆژی دوایی و بێ باوەڕ بوون پێی.

گەر گەشتێکی خێرا بکەین بە ناو ئایەتەکانی قورئاندا نموونەی زۆر لەم روداوە دەبینین کەلەسەردەمی خۆیدا و لەناو عەرەبەنەفامەکاندا بیرباوەرە باو بوو کەدەیان ووت: ﴿ کیف یحیی العظام وهی رمیم ﴾ ؟! واتە: چۆن ئەو ئێسقانە زیندو دەکرێنەوە و دەبێتەوە بە مرۆڤ لەکاتێکدا پارچە پارچە بووە و بووە بەخۆڵ؟! خوای گەورەش لەوەڵامی ئەم پرسیارو وەسوەسە شەیطانیەدا دەفەرموێت : ﴿ قل یحییها الذی أنشأها أول مرة ﴾ واتە : ئەی محمد لەوەڵامی ئەم پرسیارەیاندا بڵێ ئەو زاتە دروستی دەکاتەوەو گیانی

دەکاتەوە بەبەردا کەیەکەم جار دروستی کردوە ، کە گومـانی تێدا نیـە کاتێ لەسەرەتادا ئەم بوونەوەرە دروست کرا هیچ نەبوو بەڵام خوای گەورە هەموو شتێکی هێنایە بوون سیفەتی زیندوێتی پێ بەخشین.

هەروەها خوای گەورە لەجێگایەکی تردا بەشێوەیەکی زۆر سەر سـور هێنـەر باسـی ئـەم مەسەلەیە دەکات و دەفەرموێت : ﴿ أيحسب الأنسان ألن نجمع عظامه ، بلى قـادرين !!﴾ (القيامة: ٦-٧) واتە : إنسان وای حساب دەکـات کـە دەسـەلاتمان نیـە بەسـەر کۆکردنـەوە و دروست کردنەوەی ئێسکە رزیوەکانی؟! نەخێر دەسەلات دارین بەسەر زیندوکردنەوەی.

بەڵێ شەیطان زۆریك لە مرۆڤەکانی گومرا کـردوە چ لـەکۆن و چ لـەنوێ بـەهۆی دروست کردنی شك وگومان لەدڵیاندا دەربـارەی هـاتنیڕۆژی دوایـی و زینـدوو بوونـەوەو بەهەشـت و دۆزەخ وسەرجەم ئەو لایەنانەی کە پەیوەندی بەرۆژی دواییەوە هەیە .

شەیطان تەنها دەستی نەداوەتە ئەم کـارەو دروسـت کردنـی ئـەوو وەسوەسـەیە لـەدڵی خەڵکدابەڵکو کاسـەلێس وهـاوەڵ و نزیکـەکانی خۆشـی لـەتوخمی مرۆڤـەکان هـەمان کـاری شەیطان دەکەن و خەڵکی لەباوەڕ بەخواو ڕۆژی دوایـی دور دەخەنـەوە ئـەویش بـە دروسـت بوونی دەیان و سەدان بیردۆزو ڕێچکەی گومراکەری وەك ( مارکسیـەت و داروینـزم و ... کـە هەریەك لەم ڕێچکە بی دین و بەدکارانە کاری سەرەکیان بریتی بوو لە دروست کردنی گومـان لەدڵی خەڵکیدا بۆ مەبەستی دورخستنەوە یان لەباوەڕ هێنان بەخوای گەورە و ڕۆژی دوایی.

خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿ إن وعد الله حق وأن الساعة لاريب فيـــها ﴾ واتـە: پەیمانی خوای گەورە ڕاستەو هاتنی ڕۆژی دوایی گومانی تێدانیە.

ب) ﴿ ومن خلفهم: أرغبهم في دنياهم ﴾ واتە: بەڵێن بێت لەدواوە بۆ بەندەکانت بێم و ئەویش بەخۆشەویست کردنی دنیا لەبەرچاویاندا.

گومانی تێدا نیە کاتێ مرۆڤـەکان گومنیـان بـۆ دروست بـوو لەزیندووبوونـەوە و هـاتنی ڕۆژی دوایی ، ئەوە دەسـت دەدەنـە دنیـا پەرستی و بـاوەش کـردن بـەدنیادا بەشێوەیەك هەروەك چۆن دایکێك باوەش بکات بەکۆرپەلەو جگە ڕگۆشەکەی خۆیدا.

بەڵێ هەروەك چۆن شەیطان لەداڕشتنی پیلانی یەکەمدا گەیشت بە ئەنجام و هەزاران هەزار خەڵکی لەباوەڕهێنان بەخواو ڕۆژی دوایی دورخستەوە ، ئاوا و بەهەمان شێوەش بۆ تەواو گومراکردنی بەندەکان بەردەوام لەهەوڵ داندایە بۆ چەواشەکردنی مرۆڤەکان بەیەکێ لەرێگە ساختەو بریقەدارەکانی خۆی کە ئەویش بریتیە لە خۆشەویست کردنی دنیا لەبەر چاوی خەڵکیدا.

بەراستی گەورەترین هۆکارێك کە شەیطان بەکاری هێنا بۆ گومراکردنی بەندەکان بریتی بوو لەخۆشەویستی دنیا ، ئەمڕۆ تاکە بەربەستێك لەبەردەم خەڵکیدا کەنایەنە ناو ئیسلامەوە و خۆیان تەسلیمی خوای گەورە ناکەن بریتیە لەدنیا پەرستی و لەبیر کردنی ژیانی نەبڕاوەی دوارۆژ .

هەر بۆ ئەم مەبەستە گەر سەرنجی ئایەتەکانی قورئان و فەرموودە بەنرخەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بدەین ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێت کە مەبەستی سەرەکی لە دروست بوونی مرۆڤەکان لەدنیادا بریتی نیە لەپەرستنی و باوەش پیاکردنی بەڵکو مەبەستەکە زۆر لەوە گەورەترە کە ئەویش تاقی کردنەوەی بەندەکانە تێیدا ، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ إنا جعلنا ما على الأرض زينة لها لنبلوهم أيهم أحسن عملا ﴾ (الكهف: ٧) واتە: ئێمە (خوای گەورە ) زەویمان ڕازاندۆتەوە و جوانمان کردووەبۆ مەبەستی تاقیکردنەوە ئێوەیە تاکو کامتان باشترین و چاکترین کرداری تێدا ئەنجام دەدەن.

بەڵێ مەبەستی سەرەکی لەسەر شانۆی ژیان بریتیە لەچاندنی تۆوی چاکە یان خراپە لەسەر زەویدا و پاشان دروێنەکردنی لەڕۆژی دواییدا هەروەك پێغەمبەر ( ﷺ) دەفەرموێت : ((الدنيا مزرعة الآخرة)) واتە: دنیا کێڵگەی دوارۆژە... یان دەفەرموێت: ((كن في الدنيا كأنك غريب أو عابر سبيل)) واتە : لەدنیادا وابژی کەوا بزانی کەسێکی غەریب و ڕێبواری.

بەڵام شەیطان (عليه اللعنة) ئەوەندە مرۆڤەکان ڕۆدەچێنێ لەخۆشەویستی دنیادا تا ئەو پلەیەی کە بیپەرستن ولەبری خوای گەورە کڕنوشی بۆ بەرن.

ج) ﴿ وعن أيمانهم ﴾ ( أشبه عليهم أمر دينهم ) واتە : کاتێ لەڕوکاروجەمسەری لای ڕاستەوە دێم بۆ بەندەکان گومانی خراپیان لەبارەی دین و بیروباوەڕ یانەوە بۆ دروست دەکەم . بەڕاستی گومان دروست کردن بەهێزترین چەکە بۆ دور خستنەوەی خەلکی لەخوا پەرستی و دینداری ، گومان لەبیروباوەڕ و دیندا وەك کرمێکی خۆرە و زیان بەخش وایە بۆ دارێکی بەهێز و بەردار . شەیتان کاتێ لەلای ڕاستەوە دێت بۆ مرۆڤەکان ئەوەندە وەسوەسە و گومانی خراپ لەدلەکاندا دروست دەکات تائەو پلەیەی گومانی وەها بەرن کەئاخۆ کێ پەروەردگاری دروست کردووە (والعياذ بالله) هەروەك لەفەرمودەی پێغەمبەردا ئاماژەی بۆ کراوە و دەفەرمێت: ((يأتي الشيطان أحدكم فيقول من خلق كذا من خلق كذا ؟! حتى يقول من خلق ربك ؟! فأذا بلغه فليستعذ بالله والينته)) (رواه البخاري ومسلم) واتە : شەیتان دێت بۆلای کەسێکتان و پێتان دەلێ : ئەو شتە کێ دروستی کردووە ؟! بۆ نمونە دەلێ ئەو کورسیە کێ دروستی کرووە ؟! تۆش دەلێیت ئەودارتاشە - لەپاشاندا ئەوەندەت پرسیار لێدەکات تا دەلێ ئەی کێ پەروەردگارتی دروست کردووە؟ هەرکات ئەم وەسوەسەی بۆ دروست کردن ئەوە پەنابگرن بەخوای گەورە لەشەیتانی دور لەڕەحمی خوا و بلێیت (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) و لەوە زیاتر بیر مەکەنەوە و بوەستن،بەلێ شەیتان ئامانجی خۆی پێکاوە و گومانی خراپ ی بۆ زۆرێك لەخەلکی دروست کردووە و لەڕاستیە دینیەکان دووری خستونەتەوە ئەویش بەوەی کەدەچرپێنێ بەگوێچکەیاندا و وەسوەسەیان بۆ دروست دەکات و پێیان دەلێ : کێ دەلێ خوا هەیە ؟! باشە گەر هەیە بۆ من نای بینم ؟! بۆ گوێبیستی دەنگی نابم ؟! تۆ بلێ ی ئیسلام لەدنیای واقعدا جێ بەجێ بکرێت ؟! دین تەنها چەند دروشمێکی خەیالییە؟! ئیسلام تەنها بۆ ماوەی ( ١٠ تا ١٢) سالْ بەباشی جێ بەجێ کراو ئەویش لەسەردەمی پێغەمبەردا و پاشان بەو جۆرە نەمایەوە ؟! مێژووی ئیسلامی مێژوویەکی خوێناوی داگیر کردنە ؟ بەرگی حیجاب دیاردەی کۆنەپەرستیە ؟! بێ باوەڕی دیاردەی زانست و بەرەوپێش چونی ولاتە ؟! ئیسلام کۆمەلگای دواخستوە و بوەتە بەرەستێك لەبەردەم بەرەو پێش چوونی ولاتدا ؟! قورئان

لەلایەن خواوە نەهاتووە و دروست کراوی دەستی (محمد)ەو لەقەشە و پاپاکانی سەردەمی خۆی وەری گرتووە؟! هەموو ڕوداوێك لەدنیادا بەڕێكەوت ڕوودەدات و پەیوەندی بەقەدەرەوە نیە ؟! مرۆڤەكان لەسەرەتادا مەیمون بوون و پاشان گەشەیان كردوو بون بەم مرۆڤە ؟! دنیا لەماددە دروست بووە و دروست كەر و بەدی هێنەری نیە؟! وەدەیان و سەدان هەزار گومانی تری لەم جۆرە . بەڵێ ئ م قسانە چەند شتانێكی خەیاڵی نین و بەردەوام گوێمان لەم قسانە دەبێت و خەڵكانی دور لەخوا و بەندە دڵسۆزەكانی شەیتان بەوپەڕی شانازیەوە و لەهەموو جێگاو شوێنێك ئەم قسە بێ ناوەڕۆك و شەیتانیانە دەكەن .

(د) ﴿ وعن شمائلهم ﴾ : ( أشهي لهم المعاصي ) واتە : كاتێ لەجەمسەری لای چەپەوە دێم بۆ بەندەكانت تاوانیان زۆر لاخۆشەویست دەكەم و تاوانیان زۆر پێدەكەم . بەڵێ گەر بەوردی سەیرێكی حاڵی خەڵكی ئەمڕۆ بكەین زۆر بەئاشكرا دەبینین كەوا تەمەنی درێژی خۆیان بەتاوان تۆمار كردووە و ئەوەندە تاوانیان لا خۆش و شیرینە شانازی پێوەدەكەن و لەكۆڕو كۆمەڵگادا بەوپەڕی خۆشحاڵیەوە باسی دەكەن و لەگەڵ ئەوەشدا لەكەناڵەكانی ڕاگەیاندنەوەبەناو كۆمەڵگادا بڵاودەكرێتەوە و لەلایەن هەزاران هەزار خەڵكەوە سوپاس دەكرێن . بەڕاستی جێ ی داخە ئێمەی خاوەن پەیامی ئاسمانی و بەندەی پەروەردگارێكی میهرەبان و بەخشندەو شوێن كەوتەی سەروەری مرۆڤایەتی (محمد) (ﷺ) كەوا بوینەتە بەندەی شەیتان و كردومانەتە ڕابەر و پێشەوای خۆمان و لەفەرمانە دۆزەخیەكانی دەرناچین ؟! خوای گەورە باوەشی ڕەحمەت و لێ خۆش بوون و نعمەتە بێ سنورەكانی خۆی بۆ كردوینەتەوە و بەردەوام بانگمان دەكات بۆ چاكە خوازی و یارمەتی دانی یەكتری لەكاری خێردا وەك دەفەرمێت: ﴿ إن الله يأمر بالعدل والأحسان ﴾ واتە: پەروەردگارتان فەرمانتان پێ دەكات بەدادپەروەری و چاكە خوازی ، یان دەفەرمێت: ﴿ وتعاونوا على البر والتقوى ﴾ واتە : هاوكاری یەكتری بكەن لەسەر چاكەو خوا پەرستی و تاوان نەكردن و ترسان لەخوای گەورە ، لەگەڵ ئەوەشدا شەیتان باوەشی خراپە و تاوان و دۆزەخی بۆ كردوینەتە وە بانگمان دەكات بۆ خەسارەتمەندی دنیاو قیامەت ، بانگمان

دەکات بۆ هاوەڵ دانان بۆ خوای گەورە (سبحانە) بانگمان دەکات بۆ بێزێزی و سەرکزی دنیاو دوارۆژ ، بانگمان دەکات بۆ دۆزەخ و رقی خوایی ، هەروەها لەدنیادا فەرمانمان پێ دەکات بەتاوان وخراپەکاری ﴿ إنما يأمركم بالسوء ﴾ واتە :شەیتان فەرمانتان پێدەکات بەکردنی خراپە و تاوان ، ئەمڕۆ ئێمە پەروەردگارمان لەیاد کردووە و باوەشمان کردووە بەشەیتان و دۆزەخدا؟!

ئەوەندە تاوانمان لاسوك و ئاسان بووە گەر ڕۆژی تاوان نەکەین تەوا و بێ زار و بێ تاقەت دەبین و هەست بەزیانێکی گەورە دەکەین ،ئەمڕۆ شەیتان تاوانی ئەوەندە ڕازاندۆتەوە لەبەر دەمماندا کە زۆر بەشانازیەوە لەناو خەلکیدا باسی بکەین و خۆمانی پێ بەرینە پێشەوە و خوازیاری ئەوەین هەموو خەلکی بمان ناسێ و لەکەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە دەیان جار باسمان بکەن و بەنمونە لەناو خەلکیدا بهێنرێینەوە ، لەهەمان کاتیشدا گەر خوا پەرستیەك ئەنجام بدەین و ڕەوشتێکی جوان تۆمار بکەین ئەوە زۆر بەحەزەوە دەبێت ئەنجامی بدەین و ئاواتە خوازین کەس هەستمان پێ نەکات و ناومان نەزرنگێ ئەویش لەبەر ئەوە نیە کەئەو کارە چاکە تەنها بۆ خوا دەکین و دورە لە (ریا بازی) بەلکو لەبەر ئەوەیە کەخەلکی تانەوتەشەرمان لێ نەدات و سەر زەنشتمان نەکات . کەواتە ئێستا ڕوبکەینە کوێ؟! چارمان چیە؟! چ هۆکارێك بگرینەبەر بۆ دەرباز بونمان لە شەیتان و دۆزەخ و نەکردنی تاوان و خراپەکاری ؟!

لەوەڵامدا دەڵێین : بێ گومان ئیسلام چارەسەری هەموو دەرد و نەخۆشیەکی کردووە و چارەسەری پێویستی بۆ سەرجەم کێشەکان دیاری کردووە وەلەناو هەموو شیاندا تاوان نەکردن و خۆپاراستن لە شەیتان و فێڵەکانی کەگرنگ ترین هۆکارێك بۆ نەکردنی تاوان و خۆدەرباز کردنمان لەخراپەکاری بریتیە لەم خاڵانەی خوارەوە:-

(أ) قیمەت و کێشی تاوان بزانین و پاشان هەڵیسەنگێنین کەئاخۆ تاوان چەندە سوکە و بکەریشی چەند بێ ڕێزە لەناو کۆڕ و کۆمەلگادا . بۆ نمونە سەیرێکی هەریەك لە( دزی ، پیاو کوشتن ، زینا کردن ، کاری سوخۆری ، نەزەرکردن و جوێن دان و داوێن پیسی و

جەواشە کردنی خەڵکی و سەرجەم تاوانەکانی تر) بکەین ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێت کەتاوان خۆی لەخودی خۆیدا زۆر بێ ڕێزە و قیمەتی نیە .

(ب) سەیری چارەنوسی تاوان باران و گوناه باران بکەین کەچەندە لەدنیادا بێ ڕێز و کەم بوون و پاشان چارەنوسیشیان بەچی گەیشتووە . هیچ کەسێ لەدنیادا کەسێکی دزی خۆش ناوێت یان ڕێز لەداوێن پیسێك ناگرێت یان چارەی سەرخۆشێکی ناوێت یان باوەڕومتمانە بەدرۆزن و دەست برێك ناکات یان ئەمانەت لای دەست برێکی فێڵ باز دانانێت و بەو شێوەیە ، ئەمە حاڵیان لەدنیاو کاتی ژیانیان ، پاشان حاڵ و چارەنوسی هەریەکەیان لەکاتی مردن و پاشان لەدوا ڕۆژیشدا بەرەو کوێ ڕۆیشتوە،بۆ نمونە فرعەونی تاوان بار لەدنیادا خوای گەورە غەرقی ئاوی کردو خنکاندی و ڕسوا بوو ، یان گەلەکەی پێغەمبەر (لوط) (علیه السلام) خوای گەورە لەدنیادا هەڵی گێڕانەوە و لەناوی بردن ، پاشان گەلەکەی (نوح) (علیه السلام) خوای گەورە بەلافاو لەناوی بردن و ماڵ و خانوی بەپێوە نەهێشتن ، هە وەها هەر یەك لەتاوان بارانی وەك (هامان و قارون و نەمرود و ئەبو جەهل و ئەبو لەهەب و ئەبرەهە و ... ) کەهەریەك لەم کەس و کۆمەڵانە لەدنیادا بەهۆی تاوان و خراپەی خۆیان و شوێن کەوتنی شەیتانەوە بەر سزای خوای گەورە کەوتون و ڕسوا بوون ، پاشان سزا گەورە و توندەکەی قیامەتیشیان مسۆگەرە و بواری ڕزگار بوون و خۆڵ دزینەوەی نیە کەهەریەك لەو تاوان بارانە لەگەڵ شەیتاندا بەرەو سزا توند و سوتێنەرەکانی پەروەردگار دەبرێت و هەریەکەیان لە نهۆمێکی دۆزەخ دادەنرێت و سزا دەدرێت ، هەروەك خوای گەورە دەفەرمێت: ﴿ أَلْقِيَا فِي جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٍ ﴾ واتە : هەڵیان بدەنە ناو دۆزەخەوە هەموو ئەو کەسە بێ باوەڕانەی کە عیناد بوون و ئینکاری حەقیان دەکرد . یان لەبارەی سزای دنیاو قیامەتیانەوە دەفەرمێت: ﴿ لَهُمْ فِي الدُّنْيَا خِزْيٌ وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾ واتە: لەدنیادا ڕسوا و سەرشۆڕ دەبن و لە دوا ڕۆژیشدا سزایەکی زۆر گەورەیان بۆ هەیە .

(ج) بیر کردنەوە لەمردن و ڕوداوە ترسێنەر و تۆقێنەرەکانی خوای گەورە . بێگومان ئەم خاڵەش یەکێکی ترە لەو هۆکارە گەورە و کاریگەرانەی کە مرۆڤەکان دووردەخاتەوە لەتاوان و ڕێگە شەیتانیەکان ، ئەویش بەو شێوەدەبێت کە ئینسان ئەوەندە بیر بکاتەوە لەمردن کەلەو کاتەدا دەمرێت کەتاوانەکە دەکات ، بێگومان ئاشکراشە کەهیچ کەسێ نازانێ

کەی دەمرێ و لەکوێش دەمرێ و بەئیمانەوە دەمرێ یان بەبێ ئیمان ، کەواتە مادەم وایە دەبێت ئینسان بەردەوام وادەست بکات کەئەو ساتەی ئەو بەسەری دەبات جا بەچاکە بێت یان بەخراپە ئەوە هەر دەمرێت، ئەوە ئەم حاڵەتەی بۆی دەبێتە بەربەستێکی زۆر گەورە لەنەکردنی ئەو تاوانە و بەئەنجام نەگەیاندنی ، پاشان یادی دوای مردن بکاتەوە کە ڕۆژی قیامەت دێتە پێشەوە و تۆش یەکێکی لەئەندامانی قیامەت و بەتاك و تەنهایی دەچیتە خزمەت پەروەردگارت هەروەك دەفەرمێت: ﴿ لقد جئتمونا فرادا كما خلقناكم أول مرة ﴾ واتە :ئەوە بەتاك تاك گەڕانەوە بەردەستمان هەروەك چۆن لەسەرەتا بەتاك دروستمان کردن . پاشان تۆی تاوان بار بە( ڕوت و قوتی و بەخەتەنە نەکراوی و بەپێ ی پەتی [1] دەچیتەوە بەردەم پەروەردگارت و لەسەر دەقە دەقەی ژیانت پرسیارت لێ دەکرێت و دۆزەخیش لەولاوە داگیرسێنراوە و لەگەرمی و بڵێسەی خۆیدا خەریکە لەت لەت و پارچە پارچە دەبێت [2] و تۆش سەرجەم کاتەکانی ژیانی گەنجی و بەخراپەو تاوان و بێ فەرمانی خوا و هەواو ئارەزودا بردۆتە سەر و گەر کردبێشت نوێژێکی کرچ و کاڵ و بێ ناوەڕۆکت کردووەو هیچی تر ، بیرکەرەوە لەوکاتەدا چی دەکەی ؟! کێ دێت بەهاناتەوە ؟! کێ تاوانەکانت هەڵدەگرێ و چاکەکانی خۆیت دەداتێ ؟! کاتێ پەروەردگارت پێت دەڵێ فلانە خراپە و تاوان و بێ فەرمانی منت بۆ کرد چۆن وبەچ ڕوویەکەوە وەلامی دەدەیتەوە ؟! دەبێت دڵت چەندە بەخێرای لێبدات و چ ترس و ناڕەحەتیەکی لێ بنیشێ ؟! کەواتە خوشك و برای باوەڕدار ئەوەندە بەسە بڵێین کە: خوای گەورە لەبارەی قیامەتەوە بفەرمێت: ﴿ وترى الناس سكارى وماهم بسكارى ولكن عذاب الله شديد ﴾ واتە : خەڵکی دەبینی سەرخۆشن بەڵام سەرخۆشی عارەق خواردنەوە نین بەڵکو لەسزای سەختی خوای گەورە سەرخۆش بوون ، هەروەها پیاو چاکێك لەبارەی مردنەوە دەفەرمێت: (كفى بالموت واعظا) واتە: بەسە مردن ئامۆژگاریمان بکات و لەتاوان دورمان بخاتەوە.

---

(١) پێغەمبەر(ﷺ) لەم بارەوە دەفەرمێت ( إنكم محشورون حفات عرات غرلا) (متفق عليه) واتە : ئێوە کۆدەکرێنەوە بەپێ ی پەتی و ڕوت و قوتی و خەتەنە نەکراوی ).

(٢) خوای گەورە دەفەرمێت ﴿ تكاد تميز من الغيظ ﴾ (الملك:٨) واتە : خەریکە دۆزەخ لەداخا پارچە پارچە ببێت .

تێبینی : تەفسیری ئەم چوار خاڵەی پێشووم لە(إبن کثیر)ەوە وەرگرتووە بەرگی(٢) لاپەڕە(٢٠٤).

(١٠) شەیتان پاش ئەوەی سوێندی بەعزەت و گەورەی پەروەردگاری خوارد و پەیمانی دا کەسەرجەم بەندەکان گومڕا بکات و بەرەو دۆزەخیان بەرێتەکۆاتە ئێستا کێ بەرەو بەهەشت دەڕوات ؟! یان بڵێین چی بکەین تا بگەینە بەهەشت ؟ ئاخۆ دەبێت چ کردەوە و سیفەتێکمان تێدابێت تا بگەینە بەهەشت ؟ بەڕاستی گەر خوای گەورە ڕەحم و ڕێگە نیشاندەر و ئاگادار کەرەوەمان نەبێت ئەوە سەرەنجام مرۆڤەکان بەکۆمەڵ و لەدوای شەیتانی گومڕا کەرەوە بەرەو سزا سوتێنەر و گەرمەکانی دۆزەخ دەبرێن و لەو بەهەشتە خۆش و پڕ نعمەتە بێ بەش دەبین .

بەڵام نەء وانیە گەر سەرنجی کۆتای ئایەتەکە و قسەکەی شەیتان بدەین ئەوە وەك باس کردنی حاڵەتێکی (إستسنائی) کۆمەڵێك جیادەکاتەوە و بەر ئەو سزا سەختە ناکەون کە خوای گەورە بۆ شەیتان و شوێن کەوتوانی ئامادەی کردووە کەئەویش بریتیە لە( إخلاص ) واتە: دڵسۆزی لەهەموو ڕەفتار و کردارێکدا کەهەموو تەمەنی ژیانت بۆ پەروەردگارت سەرف بکەیت و کەس نەکەیتە هاوەڵی لەهیچ شتێکدا ، هەروەك دەفەرمێت ﴿ إلا عبادك منهم المخلصين ﴾ (ص: ٨٣).

بەڵێ دڵسۆزی لەکارکردن و خواپەرستیدا بەرهەمی سەرجەم ماندوو بوون و هیلاك بوونتە هەربۆیە خوای گەورە فەرمان دەکات بەبەندەکانی کە بە دڵسۆزی و(إخلاص)ەوە کاریکەن و لەخۆ دەرخستن و(ریا) بازی بەدووربن هەروەك دەفەرمێت: ﴿ وما أمر إلا ليعبـــدوا الله مخلصين له الدين ﴾ واتە : ئایا فەرمانتان پێ نەکراوە کە بەدڵسۆزیخوای گەورە بپەرستن؟

بەڵێ لە کۆتایی پەند و ئامۆژگاری بەندی یەکەمدا حەز دەکەم چەند بەرهەمێکی دڵسۆزی و (إخلاص) بخەمە ڕوو تا لەکارەکانماندا سەرکەوتووبین و شەیتان نەبێتە هۆکارێك بۆ گومڕا کردنمان .

(أ) ئەوکەسەی کەبە(إخلاص)ەوە لەدنیادا خوا دەپەرستێ و کار بۆ ئیسلام دەکات ئەوە شەیتان زۆر لێ دوورە و هەرگیز ناتوانێت توشی خراپە و تاوانی بکات و ئەم بەندە دڵسۆزە لەهەر شوێن و جێگایەکەوە بڕوات شەیتان بەو جێگەیەدا ناڕوات ، هەروەك (عومەری کوری خطاب) کە پێغەمبەر (ﷺ) پێ ی دەفەرموێت: ((إني لأنظر شياطين الجن والأنس فروا من عمر)) [1] واتە : من-پێغەمبەر-دەبینم کەوا شەیتانە مرۆڤی و جنۆکەکان لە(عمر) رادەکەن. بەڵێ ئەمە بەرهەمی بۆ خوا گوێڕایەڵی و (إخلاص)ە و تەنها پەیوەست نیە بە(عمر)ەوە بەڵکو هەرکەسێ دڵسۆز بێت و سیفەتی (إخلاص) ی تێدابێت ئەوە هەمان حوکم دەی گرێتەوە و شەیتانەکان لە-مرۆڤ و جنۆکە -لێ ی رادەکەن.

(ب) ئەو کەسانەی بە(إخلاص)ەوە کاردەکەن و لە(ریا) بازی دوورن زۆر بە عیزەت و رێزدارن لای پەروەردگار و پاشان لای خەڵکی چونکە ئەوەی دەیکەن تەنها بۆخوایە و لەبەر خوایە و بۆ خۆ بردنە پێشەوە و سنگ دەر پەڕاندن نیە .

(ج) چارەنوس و عاقبەتی مرۆڤە (مخلص)ەکان بریتیە لەبەهەشت و رازی بوونی خوای گەورە و رزگار بوونیان لەدۆزەخ و سزای خوایی.

## چەند ڕونکردنەوە و سەرنجێك لەباسەکانی بەندی یەکەم

(١) ئایا جیاوازی چیە لەنێوان جنۆکە و مەلائکەتدا ؟! وەلام : بێگومان گەر سەرنجێکی ووردی ئایەت و فەرموودەکانی پێغەمبەر بدەین (ﷺ) ئەوە جیاوازیەکی زۆرمان بۆ دەردەکەوێت کەهەریەك لە و دوو دروست کراوەی خوای گەورە چەند سیفەت و تایبەت مەندیەکی سەربەخۆی هەیە و لەیەك تری جیاوازن کە گرنگترینیان .

(أ) مەلائکەت لەنور دروست کراون هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمێت: ((خلقت الملائكة من نور)) [2] بەلام جنۆکە دروست کراون لەئاگر هەروەك دەفەرمێت: ((وخلقت الجان من مارج من نار)) [3] هەردوو فەرمودەکە ئەوە دەگەیەنن کەمەلائکەت لە(نور) دروست بووە و جنۆکەش لە(ئاگر).

(١) رواه الترمذي بأسناد صحيح (صحيح الجامع /ج٢/ص٣٢٩) وعالم الجن والشياطين /دكتور عمر سليمان الاشقر /ص٣٤-٣٥)

(٢) رواه مسلم.

(٣) رواه مسلم.

(٢) مەلائکەتەکان نەفسیان نیە و هەرگیز خراپە ئەنجام نادەن و بێ فەرمانی خوای گەورە ناکەن و بەردەوام لەپەرستنی خوای گەورەدان هەر وەك قورئان دەفەرمێت: ﴿ لایعصون الله ماأمرهم ویفعلون ما یؤمـــرون ﴾ واتە : مەلائکەتەکان سەرپێچی ئەو فەرمانە ناکەن کەپێیان دەدرێت لەلایەن خوای گەورە و ئەوەی پێیان دەوترێت دەست بەجێ و بێ دواکەوتن بەئەنجامی دەگەیەنن . بەڵام جنۆکە بەپێچەوانەوەیە نەفسیان هەیە و بەویستی خۆیان دەتوانن چاکە بکەن و خراپەش بکەن هەروەك قورئان لەسەر زمانی خۆیان بۆمان باس دەکات و دەفەرموێت: ﴿ وأنا منا الصالحون ومنا دون ذلـــك ﴾ (الجن: ١١).. واتە : لەناو ئێمەدا جنۆکە - پیاوچاك وپیاوخراپی تێدایە.

یان دەفەرموێت : ﴿ وأنا منا المسلمون ومنا القسطون فمن أسلم فأولئك تحروا رشدا وأما القاسطون فكانوا لجهنم حطبا﴾ (الجن : ١٤-١٥) واتە : ئێمە هەندێکمان مسوڵمانین و هەندێکمان ستەم کارین ، پاشان هەر کەسێك گەردن کەچی کردئەوە بەڕاستی ڕێی ڕاستیان گرتووە ، هەروەها ستەمکارەکان دەبنە سووتەمەنی دۆزەخ.

(٣) مەلائکەتەکان ناخۆن و ناخۆنەوە بەڵام جنۆکە دەخوات و دەخواتەوەهەروەك پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرموێت : (( إذا أكل أحدكم فاليأكل بيمينـه، وإذا شرب فليشرب بيمينـه فإن الشيطان يأكل بشماله ويشرب بشماله )) (رواه مسلم عن إبن عمر).

واتە : کاتێ یەکێکتان خواردنی خواردبابەدەستی ڕاستی بیخوات ومکاتێ خواردنەوەی خوارد یا بەدەستی ڕاستی بیخوات چونکە شەیطان بەدەستی چەپ دەخوات و دەخواتەوە.

ئەمەو چەندین فەرموودەی تری لەم جۆرە بەلگەن لەسەر ئەوەی کەشەیطان و جنۆکەکان دەخۆن و دەخۆنەوە ، هەروەك لەصحیحی (بخاری)دا هاتووە کە دەفەرموێت (بەشیاکەی وشکەوەبوو و ئێسقان خۆتان پاك مەکەنەوە چونکە خواردنی جنۆکەکانە)

(٤) لەناو مەلائکەتەکاندا نێرو مێ نیە بەڵام لەناو جنۆکەکاندا نێرو مێیان تێدایە ، ئەویش بەبەلگەی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرموێت (کاتێك چونە سەر ناو

بۆ مەبەستی دەست بەئاو گەیاندن بڵێین : ﴿ اللهم إني أعوذ بك من الخبث والخبـــائث ﴾ (رواه البخاري ومسلم) .. واتە : ئەی پەروەردگارم پەنا دەگرم بەتۆ لەشەیطانی نێرو مێ .

( ٥ ) ..مەلائکەتەکان وێنەیان جوانە ئەویش بەهۆی ئەوەی کە خـوای گـەورە لـەنور دروستی کردوون ، هەروەك قورئان لەم بارەوە دەفەرموێت: ﴿ علمه شديد القوى ذو مرة فاستوى ﴾ (النجم: ٦) .(إبن عباس) لەتەفسیری (ذومرة ) دا دەفـەرموێت (ذو منظر حسن) واتە: دیمەنێکی جوانیان هەیە.

بـەڵام جنۆکـە و شـەیطانەکان وێنـەیان ناشیرین و ترسناکە هـەر بۆیـە خـوای گـەورە نموونـەی درەختـی (زەقـوم) کەلـە دۆزەخدایـە دەی هێنێتـەوە بەسـەری شـەیطانەکان و دەفەرموێت: ﴿ إنها شجرة تخرج في أصل الجحيم ، طلعها كأنــــه رؤوس الشـــياطين ﴾ (الصافـــات: ٦٤–٦٥).. واتـــە: داری زەقـــوم دارێکـــە لـــە قوڵایـــی دۆزەخـــەوە دەردێ و خونچەیسەرلقەکانی لەسەری شەیطانەکان دەچێ.

کەواتە ئێستا دەزانین و بۆمان ڕون بویەوە کە (مەلائکەت و جنۆکـە) دوو جۆر دروست کراوی جیاوازن و خاڵی جیـاواز زۆرە لـەنێوانیاندا ، بـەڵام ئـالێرەدا پرسیارێکی تـر دروست دەبێت کە ئەویش بریتیە لە:

پرسیار: ئایا کە ئێمە دەزانـین جنۆکـەو مەلائکەتـەکان جیـاوازن و خـاڵی جیـاوازی زۆر هەیە لەنێوانیاندا کەواتە چۆن ئەو فەرمانەی کەلەلایـەن خـوای گـەورەوە بڕیـاری لەسـەر درا دەربارەی کڕنوش بردنیان بۆ ئادەم هەموویانی گرتووە لەکاتێکدا لە ئایەتەکەدا تەنـها نـاوی مەلائکەت هاتووە ؟! هەروەك دەفەرموێت : ﴿ وإذ قلنا للملائكة اسجدوا لآدم فســجدوا إلا إبليس ﴾ ؟! بەڵێ توێژینەوە دەربارەی ئەم ئایەتە و چەند ئایەتێکی ترئەلەم جۆرە ئـەو پرسیارەی لـەدڵی خـەڵکیدا دروست کـردووە کـە دەڵێـن : لەئایەتـــەکاندا وا دەردەکـەوێت کەتەنها فەرمان کراوە بە مەلائکەتو شەیطان و جنۆکەکان بەشـدار نـین بـەڵام خـوای گـەورە بەشداریان دەکات وا دەردەکەوێت کە فەرمانەکە بۆ هەردوولایە (مەلائکەت و جنۆکەش)

(شیخ الأسلام إبن تیمیة) لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا دەفەرموێت: (إن الشیطان کان الملائکة بإعتبار صورته ،ولیس منهم بإعتبار أصله ولإعتبار مثاله)[1] واتە: شەیطان لەوێنەدا بەمەلائکەت حساب دەکرێت ، بەڵام لە بنچینەو ناوەڕۆکدا وەك مەلائکەت حساب ناکرێت.

**بەڵێ شەیطان لەهەندێ خاڵدا جیاوازی نیە لەگەڵ مەلائکەتەکاندا کە بریتین لە:**

أ) مەلائکەت و شەیطان دروست کراوی خوای گەورەن و لەم خاڵەدا هیچ جیاوازیەك نیە.

ب) مەلائکەت و جنۆکە سیفەتێکی هاوبەشیان هەیە کەبریتین لەوەی کە مرۆڤەکان دەبینن ،بەڵام مرۆڤەکان ئەوان نابینن، هەروەك قورئان دەربارەی ئەم مەسەلەیە دەفەرموێت : ﴿ إنه یراکم هو وقبیله من حیث لاترونهم ﴾ (الأعراف: ٢٧)..واتە: جنۆکەکان ئێوە دەبینن بەڵام ئێوە ئەوان نابینن ، وە بۆ مەلائکەتیش بەهەمان شێوە.

ج) مەلائکەت و جنۆکەکان لەلایەن خوای گەورە وەفەرمانیان پێ کراوە بە گوێ ڕایەڵی کردنی خوای گەورە پەرستنی هەروەك دەربارەی مەلائکەت دەفەرموێت : ﴿ ویفعلون ما یؤمرون ﴾ واتە: ئەوەی فەرمانیان پێکراوە جێ بەجێ دەکەن ، هەروەها لەبارەی جنۆکەشەوە دەفەرموێت : ﴿ وماخلقت الجن والانس إلا لیعبدون ﴾ (الذاریات: ٥٦). واتە: جنۆکە و ئینسانم دروست نەکردوە تەنها بۆ پەرستن نەبێت، (یان بەشێوەیەکی تر ) مەبەستی سەرەکی لەدروست کردنی جنۆکەو مرۆڤەکان بریتیە لەوەی کە خوای گەورە بپەرستنو هاوەڵی بۆ پەیدا نەکەن.

د) مەلائکەت و هەندێ لەجنۆکەکان باڵیان هەیە کە ئەم سیفەتەش خاڵی هاوبەشە لەنێوان جنۆکەو مەلائکەتەکاندا ، هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی (جوبرەئیل) دەفەرموێت (٦٠٠) باڵی هەیەو هەروەها دەربارەی هەندێك لەجنۆکەکان دەفەرموێت : ((الجن ثلاثة أصناف ، فصنف یطیر في الهواء...)) [2]

(١) مجموعة الفتاوی لأبن تیمیة ج٤ / (ص: ٣٤٦).

(٢) (رواه الطبراني والحاکم بإسناد صحیح (صحیح الجامع)) ..

واتە: جنۆکەکان سێ بەش و کۆمەڵن : بەشێکیان بەهەوادا دەفڕن و باڵیان هەیە.

ئەمانەو دەیان خاڵی تر بەلگەی زۆر بتەون لەسەر ڕاستێتی ئەم ڕووداوە و لە هەمووشیان بەهێز تر ئەوەیە: پاش ئەوەی فەرمان کرا بە (إبليس و مەلائكەتەکان) کە کڕنوشی ڕێز ببەن بۆ ئادەم سەرجەم مەلائكەتەکان کڕنووشیان برد تەنها (إبليس) نەبێت ، پاشان خوای گەورە بە(إبليس)ی فەرموو ئەی (إبليس) چی وای لێ کردی کە(کڕنوش) بۆ (ئادەم) نەبەیت، ئەویش لەوەڵامدا ووتی: ﴿ انا خير منه خلقتني من نار وخلقته من طين ﴾ (الأعراف: ١٢)... واتە: من لەو باشترو چاکترم چونکە منت لە ئاگر دروست کردوە ئەویش لە قوڕ ، کەواتە من باشترم!!

بەڵێ ئەم ڕوداوەش بەهێزترین بەلگەیە لەسەر ئەوەی کە فەرمانەکەی خوای گەورە شمولی هەردوولای کردووە و چون یەك بووە بۆ (إبليس) و مەلائكەتەکان ، چونکە ئەگەر وانەبوایە ئەوە بەم جۆرە دەبوو .

خوای گەورە فەرمووی بە(إبليس) ئەوە بۆ کڕنوشت نەبرد ؟! لەم کاتەدا (إبليس) لەبری ئەوەی پاساوی ئەوە بهێنێتەوە کەبڵێ (من لەو باشترم چونکە منت لە ئاگر دروست کردووەو ئەویش لەقوڕ لەم کاتەدا دەی ووت: ( ئەی پەروەردگار ) تۆ لەکاتی دەرکردنی ئەو فەرمانەدا تەنها مەبەستت مەلائكەت بووە نەك من ئەوە نیە دەفەرمویت: ﴿ وإذ قلنا للملائكة اسجدوا ﴾ کەواتە ئەی پەروەردگارم لەڕەحمەت و بەهەشتی خۆت دەرم مەکە چونکە فەرمانەکەت تەنها شمولی مەلائكەتی کردوە و ئەگەر شمولی منیشی بکردایە ئەوە دەست بەجێ کڕنوشم دەبردو بێ فەرمانی تۆم نەدەکرد؟ بەلام سەیر دەکەیت شەیطان ئەم جۆرە قسانەی نەکردو پاساوی هەڵەکەی بەم قسانە نەهێنایەوە بەمەرجێ لەم کاتەدا شەیطان لە هەموو کات زیاتر پێویستی بەبیانوو پاساو هێنانەوە هەیە بەلام لەگەڵ ئەوەشدا شەیطان هیچ یەکێ لەم قسانە ی نەکرد ، خۆ ئەگەر شەیطان دڵنیا بوایە لەوەی کە فەرمانەکەی خوای گەورە شمولی ئەو ناکات زۆر بەخێرایی و گورج وگۆڵی ئەم قسانەی دەکرد بەلام شەیطان دڵنیا بوو لەوەی کە فەرمانەکەی خوای گەورە بۆ ئەمیشە و شمولی ئەمی کردووە هەر بۆیە باسی ئەم حاڵەتەی نەکرد .

که ئەمەش بەهێزترین بەڵگەیە لەسەر ئەم ڕاستیە.

( ٢ ) زۆر کەس پرسیاردەکات و دەڵێ ، ئایا شەیطان لەسەرەتادا چی بووە؟
ئایا جنۆکە بووە یان مەلائکەت؟!

لەوەڵامدا دەڵێین :وەك لەسەرەتادا باسمان کرد شەیطان لەئاگر دروست کراوەو لەتوخمی جنۆکە یە هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿کان من الجن ففسق عن أمر ربه﴾ (الكهف: ٥٠)..واتە: ( إبليس ) لەکۆمەڵی جنۆکەکانەو لەفەرمانی پەروەردگاری دەرچووە.

بەڵام هەندێ لەزانایان لەکۆن و نوێدا دەربارەی ئەم مەسەلەیە جیاوازی هەبووە لەنێوانیاندا هەندێکیان بۆ چونیان دەربارەی (شەیطان) وابووە کە مەلائکەت بووەئەویش بەبەڵگەی ئەو ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وإذ قلنا للملائكة اسجدوا لآدم فسجدوا إلا إبليس ابى واستكبر وكان من الكافرين ﴾ (البقرة: ٣٤).

وەزۆرێکی تر لە ئایەتەکان بەڕوکەش بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە(إبليس) لە کۆمەڵی مەلائکەتەکانە وەلە هەندێ کتێبە تەفسیرەکاندا هاتووە کە دەڵێن (إبليس) لەسەرەتادا دەرگاوانی بەهەشت بووە ، وەلەهەندێکی تریاندا دەڵێت دەرگاوانی ئاسمانی دنیا بووە ، هەندێ لەزانیان دەڵێن (إبليس) بەڕێزترینی مەلائکەتەکان بووە.... ) [1] بەڵام ڕاسترین بۆ چوون لەم بارەوە بریتیە لەوەی کە بڵێین (إبليس) جنۆکە یەو لەکۆمەڵی جنۆکەکانەو جیاوازە لەمەلائکەت هەروەك قورئان دەفەرموێت : ﴿کان من الجن ففسق عن أمر ربه﴾ (الكهف: ٥٠).

---

(١) عالم الجن والشياطين (ص/١٧)

# بەندی دووەم
# جێگیر بوونی ئادەم لەبەهەشت و دروست بوونی حەوا

پێش ئەوەی بچینە سەر باس کردنی جێگیر بوونی ئادەم لەبەهەشدا پێویستە باسێکی تر بکەین کە ئەویش چۆنیەتی دروست بوونیحەوایە (علیه السلام) .

زانایان ڕاو بۆ چوونیان جیاوازە دەربارەی کاتی دروست بوونی ( حەوا) هەندێکیان دەڵێن کاتێ خوای گەورە (إبلیس) ی لەبەهەشت دەرکردوو ئادەمی جێگیر کرد بەتەنها لەوێدا مایەوە پاشان خوای گەورە خەوی بەسەردا هێنا ، لەپاشاندا خوای گەورە لەپەراسوی چەپی (حەوا)ی درووست کردوو کاتێ ئادەم هەڵسا لەخەو سەیر دەکات ئافرەتێك لەلای سەریەوە دانیشتوە پرسیاری لێ کردوو پێی ووت کێی ؟! دایکە حەواش لەوەڵامدا ووتی: من ئافرەتم؟ ئادەم لێی پرسی بۆ دروست بوویت ؟! دایکە حەواش لەوەڵامدا ووتی: بۆ مەبەستی ئەوە دروست بووم کەلەگەڵمدا بحەوێیتەوە وئیسراحەت بکەیت).[1]

خوای گەورەش وەك ئامازە کردنێك بۆ ئەم ڕاستیە دەفەرموێت : ﴿ یا أیها الناس اتقوا ربکم الذی خلقکم من نفس واحدة وخلق منها زوجها.... ﴾ (النساء: ١)، واتە: ئەی خەڵکینە بترسن لەو پەروەردگارەی کە دروستی کردوون لە یەك نەفس (کەبریتییە لەئادەم) پاشان لەئادەمیش خێزانەکەی دروست کرد _ کە حەوایە .

(إبن کثیر) لەتەفسیری ﴿ خلقکم من نفس واحدة ﴾ دا دەفەرموێت مەبەست پێی ئادەمە هەروەها ﴿ وخلق منها زوجها ﴾ ش مەبەست پێی(حەوایە).[2]

بەڵێ ئابەم جۆرە لەسەر قسەی زانایان حەوا دروست بوو لەپەراسووی لای چەپی ئادەم وە خوای گەورە زاناترە بەڕاستی (والله أعلم بالصواب)هەروەها لەسەرەتا باسمان کرد کە

(١) قصص الانبیاء - عفیف طبارة (ص: ٣٧). (٢) تفسیرإبن کثیر ج (١) ص ٤٤٨

(إبلیس) لەڕەحمەتی خوای گەورە کرایە دەرەوەو (ئادەم و حەوا)ش بە فەرمانی پەروەردگاریان لەبەهەشدا جێگیر بوون ، بەڵام مەرجی جێگیربوونیان لەبەهەشتدا[1] بریتی بوو لەوەی کە بەئازادی چی دەکەن بیکەن و حەز یان لەچ خواردن و خواردنەوە یەکە بیخۆن بەڵام نزیکی دارێك نەبنەوە کەلێیان قەدەغە کراوە هەروەك قورئان دەفەرموێت : ﴿ وقلنا یاآدم اسکن أنت وزوجك الجنة وکلا منها رغدا حیث شئتما ولاتقربا هذة الشجرة فتکونا من الظالمین ﴾ (البقرة: ٣٥). واتە: (ووتمان بەئادەم : ئەی ئادەم تۆو خێزانەکەت لەبەهەشتدا نیشتەجێ بن و ئەوەی ئارەزوتان لێی هەیەو نەفستان حەزی پێ دەکات بیخۆن بەڵام نزیکی بەری ئەو دارە مەکەونەوە چونکە لەستەم کاران حساب دەکرێن.هەروەها لە(أعراف)دا دەفەرموێت : ﴿ ویا آدم اسکن أنت وزوجك الجنة فکلا من حیث شئتما ولا تقربا هذة الشجرة فتکونا من الظالمین ﴾ (الأعراف: ١٩).

## ئامۆژگاری خوای گەورە بۆ ئادەم و حەوا بەجێگیر بوونیان لەبەهەشت

پاش ئەوەی خوای گەورە فەرمانی کرد بەئادەم و حەوا کەوا جێگیر ببن لەبەهەشت و لە نیعمەتەکانی بخۆن ئامۆژگاریەکی زۆر گەورەو ئاگادار کەرەوەشی دا بەگوێچکەیاندا کەئەویش بریتی بوو لەوەیکە دەفەرموێت: ﴿ فقلنا یا آدم إن هذا عدو لك ولزوجك فلا یخرجنکما من الجنة فتشقی، إن لك أن لاتجوع فیها ولاتعری ، وأنك لاتظمأ فیها ولاتضحی ﴾ (طە: ١١٧-١١٩) ، واتە: ووتمان بەئادەم : ئەی ئادەم بەڕاستی (إبلیس) دوژمنی خۆت و خێزانەکەتە_ واتەحەوا_ ئاگاداری خۆتان بن و کارێکی وا مەکەن کە بەهۆیەوە لەبەهەشت دەربکرێنە دەرەوە و پاشان ناڕەحەتی بچێژن وتووشی فەرمانی قورس و ببن ، ، چونکە ئێوە لەبەهەشتدا تووشی برسێتی و ڕوت و قووتی نابن و

داپۆشراون ، هەروەها لەبەهەشتدا دووچاری تونیەتی و خۆر نابن و هەتاو لێتان نادات و بێتاقەت و بێ زارتان ناکات.

## ڕۆڵی شەیطان لەدەرکردنی ئادەم و حەوا لەبەهەشتدا

پاش ئەوەی خوای پەروەردگار ئامۆژگاری ئادەم و حەوای کرد لەبەهەشت و دوژمنی سەرەکی خۆیانی پێ ناساندن کە بریتی‌یە لە(ابلیس) و هەروەها ئاگاداری کردن کە نزیکی بەری ئەو درەختە مەکەونەوە بۆ ئەوەی لەبەهەشت دەرنەکرێن لەڕیزی ستەم کاراندا حساب نەکرێن.

بەڵێ ئادەم وحەوا لەسەرەتادا زۆر پەیوەست بوون بەفەرمانی پەروەردگاریانەوە هەرگیز بیریان لەخواردنی بەری ئەو درەختە نەدەکردەوە و زۆر بەخۆشی ژیانێکی ئاسودەیان بەسەر دەبرد ، بەڵام شەیطانێك ی سەرپێچی کەرو دوژمن بەئادەم تۆ بڵێی هەروا ئاسان وازبهێنێ وئەو ڕسوای و بێ چارەییەی کەبە سەریدا هاتووە هەروا ئاسانی دەستی لێ هەڵبگرێ ؟! بی گومان نەخێر ! ! کەواتە ئێستاو لەم کاتەدا پێویستە شەیطان شەوو ڕۆژ بخاتە سەر یەك بۆ مەبەستی دارشتنی پیلانێك بۆ ئادەم و حەوا تا ئەوانیش لەبەهەشت دەربکرێن و لەنیعمەتەکانی بێ بەش بن.

باشترین پیلانیش بۆ ئەم کاتو حاڵەتە بریتیە لەجوان کردن و خۆشەویست کردنی بەری ئەو درەختە قەدەغە کراوەی کە خوای گەورە فەرمانی کردووە کە نزیکی نەکەون ، ئەویش بەدروست کردنی وەسوەسەو دڵە ڕاوکێ بۆ ئەوەی دڵیان بخورپێنێ و سەرنجیان بەلای ئەو درەختەدا ڕابکێشێ :قورئان لەم بارەوە دەفەرموێت: ﴿ فوسوس لهما الشيطان ليبدى لهما ماوري عنهما من سوءاقما وقال ماهاكما ربكما عن هذه الشجرة إلا أن تكونا ملكين أو تكونا من الخالدين، وقاسمهما إني لكما لمن الناصحين ﴾ (الأعراف: ٢٠- ٢١).

واتە : شەیطان وەسوەسەی بۆ دروست کردن و بۆ مەبەستی ئەوەی کە عەورەتی داپۆشراو یان لەبۆ یەکتری دەربخات و بەڕوتی بێ بەرگی یەکتری ببینن و پاشان پێی ووتن:

وادیارە پەروەردگارتان دەیەوێت ئێوە نەبنە دوو فریشتە و هەمیشە لە بەهەشتدا نەمێننەوە ؟! هەر بۆیەخواردنی بەری ئەم درەختەی لێ قەدەغە و حەرام کردوون ، پاشان سوێندی بۆ خواردن کەزۆر بە دڵسۆزی و دەرخستنی ئەوپەری ئامۆژگاریەوە ئەم سوێندەیان بۆ دەخوات و تەنها بۆ بەرژەوەندی و سودی ئەمانەو سودو بەرژەوەندی خۆی تێدانیە ، واتە (إبلیس) .

ئەم وەسوەسەو سوێند خواردنەی ( إبلیس ) کارێکی زۆر گەورەی کردە سەر ئادەم وحەوا و لەناخەوە بزواننی کە هەڵبسن بە لەبیر کردنی ئامۆژگاری پەروەردگاریان و شوێن شەیطان بکەون قسەکەی جێ بەجێ بکەن ، هەربۆیە خوای گەورە لەپاشاندا دەفەرموێت: ﴿ فدلاهما بغرور فلما ذاقا الشجرة بدت لهما سوءاتهما وطفقا يخصفان عليهما من ورق الجنة ﴾ (الأعراف: ٢٢).

واتە : لەپاشاندا شەیطان گومڕای کردن و بەری درەختەکەی پێ خواردن و لەگەڵ خواردنی بەری ئەو درەختە دا عەورەتی داپۆشراوی هەردووکیان بەدەرکەوت و بەرووتی یەکتریان بینی ، پاشان شەرم دای گرتن و هەڵسان بە گەڵای داری بەهەشت خۆیان داپۆشی و عەورەتی خۆیان لەیەکتری دا شارد بۆ مەبەستی ئەوەی بۆ جارێکی تر عەورەتی یەکتری نەبینن.

هەروەها لەسورەتی (طه) دا دەفەرموێت : ﴿ فأكلا منها فبدت لهما سوءاتهما وطفقا يخصفان عليهما من ورق الجنة ﴾ واتە: ئادەم و حەوا لەبەری ئەو درەختەیان خوارد کەلەسەرەتادا لێیان قەدەغە کرابوو پاشان بەهۆی خواردنی بەری ئەو درەختەوە عەورەتیان دەرکەوت کەلە وەوپێش شاردرا بوەوە و عەورەتی یەکتریان نەدەبینی ، کاتێ عەورەتیان دەرکەوت دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی گەڵای درەختی بەهەشت بۆ مەبەستی داپۆشینەوەی عەروەتیان .

## دەرکردنی ئادەم و حەوا لە بەهەشت بەهۆی شەیطان

لەسەرەتا باسمان کرد کەوا خوای گەورە کاتێ ئادەم و حەوای لەبەهەشتدا جێگیر کرد مەرجی ئەوەی لەگەڵدا کردن کەنزیکی بەری ئەو درەختە مەکەونەوە بۆ مەبەستی خواردنی ، هەروەها ئاگاداریشی کردن گەشەیطان دووژمنی سەرسەخت و سەرەکی یانەو خۆیانی لێ بپارێزن و بەگوێی مەکەن ، بەڵام لەپاشاندا ئادەم ئەم ئامۆژگاریانەی پەروەردگاری لەبیر کردوو عەزمی نەما بەسەر خۆیداو فەرمانی خوای گەورەی شکاندو لەبەری ئەو دارەیان خوارد کەلێیان قەدەغە کرابوو ، قورئان دەفەرموێت : ﴿ ولقد عهدنا إلى آدم من قبل فنسي ولم نجد له عزما ﴾ (طه: ١١٥).

واتە: لەسەرەتادا پەیمانمان لەئادەم وەرگرت (ئەویش بەنەخواردنی بەری ئەو درەختە لەبەهەشتدا ) بەڵام ئادەم ئەم پەیمانەی لەبیر چویەوە و دامەزرا و خۆگر نەبوو لەجێبەجێ کردن و گوێ رایەڵی کردنیدا ، لەپاشاندا خوای پەروەردگا ر بانگی ئادەم وحەوای کردو پێی فەرموون: ﴿ وناداهما ربهما الم أنهكما عن تلكما الشجرة وأقل لكما إن الشيطان لكما عدو مبين؟! ﴾ (الأعراف: ٢٢). واتە: خوایگەورە بانگی ئادەم و حەوای کردوو پێی فەرموون : ئەی ئادەم و حەوا ئەوە خواردنی بەری ئەو درەختەتان لێ قەدەغە نەکرا بوو ؟! وەئاگادار نەکرانەوە کە شەیطان دوژمنێکی سەرسەخت و زۆر دیارو ئاشکرای ئێوەیە ؟!

بەڵێ ئا بەم جۆرە شەیطانی فێڵباز بوەهۆکاری سەرەکی بۆ دەرکردنی ئادەم و حەوا لەبەهەشت ، پاشان ئادەم وحەوا کەزانیان فەرمانی پەروەردگاریان شکاندوەو شوێن شەیطان کەوتوون دەست بەجێ هەستیان بە هەڵەو تاوانی خۆیان کردوو ڕویان کردەوە خوای گەورە و دەستی پەشیمانیان حەواداو بەیەك دەنگ وتیان: ﴿ ربنا ظلمنا أنفسنا وإن لم تغفر لنا وترحمنا لنكونن من الخاسرين ﴾ (الأعراف: ٢٣)..واتە: ئەی پەروەردگارمان ئێمە بەسەرپێچی کرنمان لەفەرمانی تۆ ستەم مان لەنەفسی خۆمان کرد ، ئەگەر نەمان بەخشی و ڕەحممان پێ نەکەیت ئەوە لەزەرەرمەندان دەبین.

خوای گەورەش لەوەلامی دووعا و پارانەوەکەیاندا دەفەرموێت:﴿ فتاب عليه وهدى ﴾ (طه: ١٢٢).. واتە: خوای گەورە تەوبەکەی لیٚ وەرگرتن وپاشان رێنموونی کردن .

هەروەها لەسورەتی (البقرة) دا دەفەرموێت : ﴿ فتاب عليه إنه هو التواب الرحيم ﴾ (البقرة: ٣٧)..واتە پەروەردگار لێیان خۆش بوو ، خوای گەورەزۆر بەرەحم و تەوبە وەرگرە و بەندەبەخشەرە.

# فەرمانی خوای گەورە بەدابەزینی ئادەم وحەواو شەیطان بۆ سەر زەوی

بەهۆی ئەوەی کە ئادەم و حەوا فەرمانی خوای گەورەیان شکاند و بەگوێی شەیطانیان کرد خوای گەورە فەرمانی کرد بەوەی کەلەبەهەشت بچنە دەرەوە و بەرەو سەر زەوی بەرێ بکەون جێگیر ببن ، هەوەك دەفەرموێت: ﴿ قال اهبطوا بعضكم لبعض عدو ولكم في الأرض مستقر ومتاع إلى حين ﴾ (الأعراف: ٢٤).

واتە: پاشان پێمان ووتن _ وەرنە خوارێ لەپلەی خۆتان – کەبەهەشتە– وەهەندێکتان دوژمنی هەندێکی ترتانن _ واتە ئادەم و حەوا دوژمنی شەیطانن وەبە پێچەوانەشەوە _ هەروەها لە سەر زەوی جێگیر ببن تا ئەو کاتەی کە ئەجەلتان دێت و دەگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگارتان .

هەروەها لەسورەتی( طه) دا دەفەرموێت: ﴿ قال اهبطا منها جميعا بعضكم لبعض عدو فإما يأتينكم مني هدى فمن اتبع هداي فلا يضل ولايشقى ﴾ (طه: ١٢٣).

واتە : دەرچن لەبەهەشت و بچنە خوارەوە هەموتان بەکۆمەڵ ، کە دوژمنی یەکترن و هەندێکتان دووژمنن بۆ هەندێکی ترتان ، پاشان ئەگەر لەلایەن منەوە_ واتە خوای گەورە _ بەرنامەو ڕێ نموییتان بۆ هات ئەوە هەر کەسێ شوێن ڕێنمویی من بکەوێت ئەوە هەرگیز لەدنیاو دوارۆژداگومڕاو نارەحەت نابێت ) (إبن عباس) لەتەفسیری ئایەتی: ﴿ فلا يضل ولايشقى) دا دەفەرموێت: (لايضل في الدنيا ولايشقى في الآخرة ﴾ [1] واتە: لەدنیادا سەرلێشێواو و گومڕا نابێت و لەدوارۆژیشدا نارەحەت نابێت...

وەلە سورەتی (البقرة) دا دەفەرموێت : ﴿ قلنا اهبطوا منها جميعا فإما يأتينكم مني هدى فمن تبع هداي فلا خوف عليهم ولاهم يحزنون ﴾ (البقرة: ٣٨). واتە: ووتمان هەموو بچنە خوارەوە لەبەهەشت ، پاشان ئەگەر لەمنەوە ڕێ نمویی یەکتان بۆ هات ، ئەوکەسەی شوێن هیدایەتی من بکەوێت ئەوە ترس و خەفەت و نارەحەتی نابێت ) .

پاش ئەوەیکە خوای گەورە ئادەم و حەوای لەسەر زەوی دامەزراند و جێگیری کردن ئامۆژگاری ئەوەی کردن کەپێی فەرموون: ﴿ فيها تحيون وفيها تموتون ومنها تخرجون ﴾ (الأعراف: ٢٥).

واتە : لەسەر زەوی دا دەژین و هەر لەوێدا دەمرن و پاشان هەر لەزەوییدا دێنە دەرەوەو خوای گەورە زیندوتان دەکاتەوە وەلەشوێنێکی تردا دەفەرموێت : ﴿ منها خلقناكم وفيها نعيدكم ومنها نخرجكم تارة أخرى ﴾ واتە: لە خۆڵی زەوی دروست کراون وپاشان دەمرن و دەچنەوە ناو ئەو خۆڵە و دەبنەوە بەخۆڵ و پاشان بۆ جارێکی تر لەزەوی دەرتان دەهێننەوە –کەرۆژی دوایی– دەکات.

---

(١) تفسير إبن كثير/ج٣/ص ١٦٨

## چەند ئامۆژگاریەك لەڕووداوەكانی بەندی دووەم

(١) خوای گەورە لەدروست بوونی مرۆڤەكان بەگشتیو دایكە حەوا بەتایبەتی دا دەفەرمویت: ﴿ یاایها الناس اتقوا ربكم الذی خلقكم من نفس واحدة وخلق منها زوجها﴾ (النساء: ١).

واتە: ئەی خەلكی لە پەروەردگارتان بترسن ئەو پەروەردگارەی كە دروستی كردوون لەیەك كەس كە( ئادەمە) وەلە ئادەمیش خێزانەكەی دروستی كردووە كە(حەوایە).

گەر سەرنج بدەین لەناوەڕۆكی ئەم ئایەتە ئەو راستیەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە كە هەموو مرۆڤەكان بەرنێرو مێ) و لە هەموو كات و سەردەمێكدا یەك بنچینەیان هەیەو دەیان وسەدان خاڵی هاوبەش وا لەنێوانیان كەلە یەكتریان نزیك بكاتەوە كەبریتین لە:

أ) سەرجەم مرۆڤەكان بەبێ جیاوازی ڕەنگ وزمان لەلایەن خوای گەورەوە دروست كراون و هیچیان لەوی تر چاك تر نین تەنها بەلە خوا ترسان نەبێت ﴿ أن أكرمكم عند الله أتقاكم ﴾.

ب) سەرجەم مرۆڤەكان لەئادەم دروست بوون و یەك باوكیان هەیەو ئادەمیش لەخۆڵ ((كلكم من آدم وآدم من تراب )) كەواتە نابێت و ڕەوا نیە كە هیچ كەسێ بە هیچ بیانوویەكەوە خۆی لەكەسی تریەگەورەترو بەڕێزتر بزانێت چونكە هەموو مرۆڤەكان لەیەك سەرچاوەو كارگەوە هاتون كەباوكە ئادەمە ،ئەمیش بەپێچەوانەیبۆچوون و قسەی هەموو ئەو كەسانەوەیە لەكۆن و نوێدا كەباوەڕیان وابووە بەردەوامیش وادەبێت كەمرۆڤەڕەش پیست وهەژارو بێ كەس و نەخوێندەوارەكان ماددەی دروست كردنیان جیاوازە لەگەڵ ماددەی دروست كردنی كەسێكی دەوڵەت دار و سپی پێست و خوێندەوار ئەویش ئەوەیكەقورەكەیئەوان بەئاوی پیس و بەرماوەی خەلكی شێلراوە و قورەكەی ئەمانیش بەئاڵتون وئاو سازگار و بێ گەردشێلراوە - كەوەختی خۆی لەناو گەلانی وەك (فارس و ڕۆم

و هند وحەضارەتە کۆنەکاندا - ئەم بیرو باوەڕە بێ ناوەڕۆکە زۆر باوبوو هەروەها ئێستاش لەم سەدەی پێش کەوتن و زانستەدا هەمان تاوان دووبارە دەکەنەوە بەتایبەتی لەو وڵاتە زل هێزانەی کە داوای مافی مرۆڤ دەکەن وەك (امریکا) کەفەضلی سپی پێستەکانی داوە بەسەر ڕەش پێستەکاندا و بە هاوڵاتی پلە سێیان حساب دەکەن!!

ج) سەرجەم مرۆڤەکان لەدنیادا پاش بەسەربردنی ساتێك لەژیانیان دەمرن و دەکرێنەوە ناو ئەو خۆڵەی کەلە سەرەتادا لێی دروست بوون ، کەئەو مرد نە (فەقیر و دەوڵەتدارو ڕەش پێست وسپی پێست و جوان و ناشرین وعەشیرەت دارو بێ کەسو لەش ساغ و ناساغ بەیەك سانی دەگرێتەوە وکەسێ لێ دەرناکات ) کەئەمەش گەورەترین رادپەروەری خوای گەورە دەگەیەنێ.

بەڕاستی ئەمڕۆ گەر مرۆڤەکان لەدنیادا چ لەکۆن و چ لە لەنوێ و چ لەداهاتووشدا یەك تۆز بەووردی بیریان لەم خاڵەهاویەشانەو ئایەتی ﴿يـا أيـها النـاس ...﴾ بکردایەوە و یەکتریان بەبرای یەکتری بزانیایە ئەوەهەگیز کەس مافی براکەی تری نەدەخواردو خاك و ئاوی یەکتریان داگیر نەدەکردوو بەردەوام یارمەتی یەکتریان دەداو بەدەم گرفت و وکێشەکانی یەکتریەوە دەهاتن !! بەڵام بەلەبیرکردنی ئامۆژگاری یەکانی خوای گەورە و پشت کردنیان لەدین و شوێن کەوتنی شەیطان شەیطان پەرستەکان سەرجەم ئەو خاڵە هاویەشانە بەرە پێچەوانە وەبوون ڕۆیشتن و برایەتی بووە دوژمنایەتیو یارمەتی دانی یەکتری بوە داگیر کردنی بەشی ئەوی تر و خۆ بەکەم زانین لە ئاست ئەوی تردا بووە خۆ بەچاکتر زانین و خۆبەزل سەیر کردن و مل نەدان بۆ قسەی حەق!!

( ٢ ) لەڕوداوی دروست کردنی حەوا دا گەورەترین خاڵمان بۆ دەردەکەوێت کە بریتییە لەدەسەڵاتی بێ سنووری خوای گەورە لەمەسەلەی شێوازی دروست کردنی بەندەکانیدا هەر یەکەی بەشێوازێك کەبەم جۆرەیە .

أ) دروست کردنی ئادەم بەبێ باوك و بەبێ دایك لەخۆڵ .

ب) دروست کردنی حەوا لەئادەم .

ج) دروست کردنی عیسا (علیە السلام ) بەبێ باوك .

د) دروست کردنی مرۆڤەکان لەدایك و باوك واتە بەهۆی دایك و باوکەوە ، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ يخلق الله مايشاء ﴾ واتە : پەروەردگار بەویستی خۆی چۆن بیەوێت دروست دەکات و بەدی دەهێنێت.

( ٣ ) دروست بوونی حەوا ئەوە دەگەیەنێ کەمرۆڤەکان لەدنیادا هەرگیز ناتوانن بەتەنها بژین ،بەتەنها کاربکەن ،بەتەنها پارە پەیدابکەن ،بەتەنها بانگەوازی بۆ گەیاندنی دینی خوای گەورە بکەن ،بەتەنها سەر زەوی ئاوەدان بکەنەوە ،......هتد) بەتایبەتی مرۆڤەکان کاتێ گەیشتنە تەمەنێکی‌دیاری کراو هەرگیز ناتوانن بەبێ خێزان بژین وژیانیان ببنەسەر ، هەربۆیە خوای گەورە یەکەم کەسێ لەپاش ئادەمەوە دروستی کرد بریتی بوو لە(حەوا) هەوەك دەفەرموێت (وخلق منها زوجها) لەئایەتێکی تردا دەربارەی ژن و خێزان دەفەرموێت: ﴿ ومن آياته أن خلق لكم من أنفسكم أزواجا لتسكنوا فيها وجعل بينكم مودة ورحمة... ﴾

واتە: یەکێکی‌تر لە بەڵگەکانی بونی خوای گەورە ئەوەیە کەلەنەفسی خۆتان ئافرەتی بۆ دروست کردون بۆمەبەستی ئەوەی بحەوێنەوە لەگەڵیاندا، هەوەها لەنێوانتاندا دانراوە کەسۆزو خۆشەویستی هەبێت،کوردیش هەر لە کۆنەوە ووتویانە (تەنهایی هەرشیاوی خوای گەورەیە).

( ٤ ) مانای قەدەغەکردنی بەری ئەو درەختە لەبەهەشتدا تاقی کردنەوەی خوای گەورە دەگەیەنێت بەرامبەر بەبەندەکانی ، ئەویش بەو شێوەیەی کەسەرجەم ژیانی‌مرۆڤەکان لەتاقی‌کردنەوەی خوای گەورە دان و ساتێك ژیان بەبێ تاقی کردنەوە ناڕوات هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إناجعلنا ماعلى الأرض زينة لها لنبلوهم أيهم أحسن عملا ﴾ (الكهف: ).. واتە: ئێمە ژیانی دنیامان ڕازاندۆتەوەو جوانمان کردووە لەبەر چاوتاندا تاوەکو بەهۆیەوە تاقی تان بکەینەوە کە ئاخۆ کامتان ژیانی دنیا گومڕای ناکات و باشترین و جوانترین کردەوە تۆمار دەکات؟!

( ٥ ) ئاگادار کردنەوە و ئامۆژگاری کردنی ئادەم و حەوا لەلایەن خوای گەورەوە ئەوپەڕی دڵسۆزی و خۆشەویستی خوای گەورە دەگەیەنێت بەرامبەر ئادەم و حەوا بەتایبەی و سەرجەم بەندەکانی تر بەگشتی ، هەروەك خوای گەورە لەپاش ئادەم و حەوا ئێمەش ئاگادار ئەکاتەوە لەشەیطانی ئەفرین لێ کراو و دەفەرموێت : ﴿ یابنی آدم لایفتننکم الشیطان کما أخرج أبویکم من الجنــــة ﴾ (الأعراف:٢٧)..واتە: ئەی نەوەکانی ئادەم ، شەیطان سەرتان لێ نەشێوێنێ وفریوتان نەدات هەروەك ئادەم و حەوای فریوداو لەبەهەشت دەری کردن .

بەڕاستی ئەمە ئامۆژگاریەکە بۆ نەوەکانی ئادەم تاڕۆژی دوایی کەئاگاداری خۆیان بن و خۆیان لەشەیطان و شوێن کەتوانی بپارێزن تاله دوارۆژدا لەبەهەشت دورنەخرێنەوەو بەرەو دۆزەخ ڕەوانە بکرێن.

( ٦ ) خوای گەورەباسی چوار نیعمەتی بەهەشت دەکات و بەئادەم دەفەرموێت: ﴿ إن لك ألا تجوع فیها ولاتعری ، وأنك لاتظمأفیها ولاتضحی ﴾ ..واتە: لەبەهەشدا تووشی برسێتی و ڕوت و قوتی نابن و هەرگیز تینو نابن و تیشکی خۆر بێ تاقەتتان ناکات! !

(ابن کثیر) لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ :

﴿ إنما قرن بین الجوع والعری لأن الجوع ذل الباطن والعری ذل الظاهر ،وانما أیضا متقابلان فالضما حر الباطن وهو العطش والضحی حر الظـــاهر ﴾ [1] واتە : برسێتیو ڕوتی زۆر لەیەکترەوە نزیکن چونکە برسێتی لەڕووکاری ناوەوە ( واتە سکی مرۆڤەکان ) بەدەردەکەوێت و گەدەی ڕوت دەبێت ،هەروەها ڕوتیش لاشەت لەدەرەوە دەردەخات و گشت گیانت دەبینن، بەهەمان شێوەش تیوینێتی وتیشکی خۆریش زۆر لەیەکترەوە نزیکن چونکە تینوێتی ناخت گەرم دەکات و گڕی تێ بەردەدا ،هەروەها

(١) تفسیر إبن کثیر . ج/٢ ، ص (١٦٧)

خۆریش بەتیشکی خۆی ڕوکاری دەرەوەت گەرم دەکات و دەی سوتێنێت.

سەرنج بدە ! ! خوای گەورە تەنها باسی (٤) نیعمەتی بەهەشت دەکات کە هیچ یەکێ لەو نیعمەتانە لە سەر زەویدا نیەکەبریتین لە:

(أ) لاتجوع : واتە هەرگیز بەهەشتیەکان برسیان نابێت ،بەلام گەر سەیرێکی سەر زەوی بکەین ئەوە دەبینین ڕۆژی دیان وسەدان کەس لەبرساندا دەمرن و گیان لەدەست دەدەن !

(ب) ولاتعری: واتە هەرگیز بەهەشتیەکان بێ جل و بەرگ وپۆشاك نابن و ڕوت نابن ، هەروەك خوای گەورە لە زۆر شوێن لەقورئاندا بەتایبەتی باسی بەرگ و پۆشاکی بەهەشتییەکان دەکات و دەفەرموێت : ئەو بەرگ و پۆشاکەی بەهەشتیەکان لەبەری دەکەن بریتیە لە (سندس وإستبرق و ئاوریشم) هەوەك دەفەرموێت :﴿ویلبسون ثیابا خضرا من سندس و إستبرق...﴾ (الکهف:٣١) بەلام گەر سەنجی خەلکی سەر زەوی بدەین ئەوە دەبینین کەوا بەشێکی زۆریان لەهەژاریدا بێ جل و پۆشاك دەژین و تەنها پارچە قوماشێکیان بەعەورەتی خۆیاندا داوە بەتایبەتی لەوولاتە دواکەوتوو هەژارەکانی وەك (سودان ، ئەفریقا، وولاتە قەبەلیەکان ، کەعەشیرەت دارن.

ج) لاتظمأ: واتە بەهەشتیەکان هەرگیز دووچاری توێنێتی نابن ، بەلام لەسەر زەوی وانیە و زۆر جار مرۆڤەکان گەر ئاویان دەست نەکەوێت دەمرن لەتۆنیاندا وەك بەردەوام دەی بیستن لەهەواڵ و دەنگ و باسەکاندا.

د) ولاتضحی: واتە بەهەشتیەکان هەگیز خۆر بێ زارو بێتاقەتیان ناکات (إبن تیمیە) دەربارەی ڕوناکی بەهەشت دەفەرموێت : ( الجنة لیس فیها شمس ولاقمر ولالیل ولانهار لکن تعرف البکرة والعشیة بنور یظهر من قبل العرش) (١) واتە: لەبەهەشتدا خۆر و مانگ و شەوو ڕۆژی تێدانیە بەڵکو بەیانی وئێوارە بەو ڕووناکیەدا دەزانی کە لەلای عەرشی خوای گەورە وە دەردەکەوێت .

(١) مجموعة الفتاوی لأبن تیمیة

بەلام لەدنیاداو لەوەرزی هاویندا بەهۆی بەرز بوونەوەی پلەی گەرماوە زۆر جار ڕێك دەکەوێت دارستانەکان گڕیان تێ بەردەبێت وهەزاران خەلك لەگەرمادا دەمرن ، هەروەها خوای گەورە لەبارەی بەهەشتەوە دەفەرمێت ﴿ لایرون فیها شمسا ولازمهریرا ﴾ واتە : نەخۆر دەبینن ونەسەرماشیان دەبێت . کەواتە هەرجێگاو شوێنێك بەتایبەتی ئەم چوار سیفەتەی تێدا بوو وەك بەهەشت وایە . ئەمەش ئەوە دەردەخات کە ئەو باخەی (جنة) ئادەم حەوای تێدا جێگیر ببوون ، ئەم چوار سیفەتەی بەهەشتی تێدابوو لەلایەن پەروەردگارەوە.

٧) یەکەم پیلانێ کە شەیطان بەکاری هێنا بۆ فریودان و لەڕێ دەرکردنی ئادەم و حەوا بریتی بوو لە وەسوەسەو دڵە ڕاوکێ هەروەك دەفەرموێت ﴿ فوسوس لهما الشیطان ﴾ بەڕاستی وەسوەسە دروست بوون لەدڵی مسوڵماندا بەرامبەر بەفەرمانەکانی خوای گەورەو دینەکەی گەورەترین ڕێگەیە شەیطان و شوێن کەوتوانی بەئاسانترین شێوە دەست بگرن بەسەر دڵ و لاشەو ژیانی مرۆڤەکانداو لەدین داری و خواپەرستی و یەکتاپەرستی دووریان بخەنەوە ، پێغەمبەر (ﷺ) لەم بارەوە دەفەرموێت:

(( الشیطان جاثم علی قلب ابن آدم فإذا ذکر الله خنس وإذا غفل وسوس )) (١)

واتە شەیطان خۆی دا کوتاوە بەسەر دڵی نەوەکانی ئادەمدا ، ئەگەر ئەو بەندەیە یادی پەروەردگاری کرد ئەوە ئەو شەیطانە خۆی گرژو بچوك دەکاتەوە و دەستەلاتی بەسەر ئەومرۆڤەوە نامێنێت ،بەلام ئەگەر لەیادی خوای گەورە بێ ئاگا بوو ئەوە وەسوەسەی بۆ دروست دەکات ! !

سەرنج بدە مرۆ ڤ گیرۆدەو بەندەی شەیطانە کاتێ لەیادی پەرەردگاری بەدوور بێت چونکە تەنها شتێك کەشەیکان وشوێن کەوتوانی پێ ی نارەحەت بن وبێ تاقەت بن بریتییە لەیادی خواو ناوبردنی خوای گەورەو دینەکەی هەر لەبەر ئەم خاڵەیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فإذا قرأت القرآن فاستعذ بالله من الشیطان الرجیم إنه لیس له سلطان علی الذین آمنوا وعلی ربهم یتوکلون ﴾ (النحل : ٩٧-٩٨)

---

(١) رواه البخاری

واتە/ کاتێ قورئانتان خوێند پەنابگرن بەخوای گەورە لەشەیطانی نەفرین لێ نەکراو چونکە شەیطان دەستەلاتی نیە بەسەر ئەو کەسانەی کەباوەڕیان هێناوەو پەروەردگاریان کردووە بە پاڵپشتی خۆیان .

کەواتە شەیطان هەرگیز دەستەلاتی بەسەر بەندەکانی خوای گەورەدانیيە وناتوانێت وەسوەسە یان بۆ دروست بکات تا ئەو کاتەی یادی پەروەردگاریان دەکەن بەلام هەرکاتێ لەیادی خوای گورە دوورکەوتنەوە و ئامۆژگاری پەروەردگاریان لەبیر کرد ئەوە ڕێگە کەبۆ شەیطان زۆر خۆش دەبێت و وەسوەسەی خراپ بۆ مرۆڤە باوەڕ دارەکان دروست دەکات .

٨) پاش ئەوەی شەیطان وەسوەسەی بۆ ئادەم وحەوا دروست کرد دوو تەماعی خستنە بەردەم کەبریتی بوون لە:

أ) شجرة الخلد : واتە : ئەی ئادەم و حەوا ڕێ ی دارێکتان نیشان بدەم کە هەرکەسێ لەبەری ئەو دارەی خوارد هەگیز نەمرێ و هەتا هەتایە لەم بەهەشتەدا بمێنێتەوە ؟! هەروەك خوایگەورە دەفەرموێت ﴿ هل أدلكم على شجرة الخلد ﴾ (طه : ١٢٠ )

ب) وملك لايبلي : واتە وەڕێ نمایتان بکەم بۆ موڵك و سامان و داراییەك کەهەرگیز کۆتایی بەسەرا نایەت و ناڕوات؟!

بەڕاستی گەورەترین شتێ کەمرۆڤەکان لەناخیاندا خۆزگەی پێ ئەخوازن و ئاهی بۆ هەڵئەمژن وهەوڵی بۆ بدەن بریتییە لە ژیانێکی نەبڕاوەکە مردنی تێدانەبێت گەرتاڕادەیەکیش ناخۆش بێت هەروەها لەگەڵ ئەو نەمریەدا موڵك و سەروەت و سامانێك کە دوایی نەیەت،بەڵێ مرۆڤەکان لەدنیادا گەورەترین هەوڵ و تێ کۆشانیان بریتییە لەم دووخاڵە سەرەکییە.

هەربۆیە لەم پێناوەدا هەڵدەستن بەخەڵك بەکوشت دان بۆمەبەستی زیاتر مانەوەی خۆیان لەژیانداو پاشان داگیر کردنی ئەو وولاتانەی کە خاك و ئاوی بەقیمەتیان هەیە

کەئەمیشیان بۆ مەبەستی دووەمەو کۆکردنەوەی موڵك و سەروەت و سامانێکی فراوان وبێ سنوورە.

کەواتە سەرجەم هەوڵی مرۆڤەکان لەژیانیاندا چ لەکاتی شەڕ دابێت یان لەکاتی ئاشتیدا بێت بۆ ئەم دوو مەبەستەیە:

أ) نەمری و زۆر ژیان لەدنیا (صراع البقاء).

ب) بەدەست هێنان و پەیداکردنی زۆرترین سەرمایە (صراع المال) ئەم دوولایەنە کەسێ هەموو ژیانی خۆی بۆ سەرف دەکات کەزۆر ماددی بێت وبیری ڕۆژی دوایی ونیعمەتەکانی بەهەشتی نەبێت ، بەڵام ئایا مرۆڤی باوەڕ داری ڕاستەقینەش وەهایە؟!

لەوەڵامدا دەڵێین نەخێرچونکە:

أ) مرۆڤی باوەڕدار دەزانێ کە چەندە لەدنیادا بژی سەرەنجام بەمردن وژیانی ناو گۆڕ دەگات.

ب) هەروەها دەزانێ کەنەمری لەدنیادا بۆ کەس نیەو یاسای خوای گەورەیە کە هەموو دەبێت بمرین گەر(١٠٠٠)ساڵیش بژین چونکە باوەڕی بەو فەرموودەی پەروەردگاری کردووە کە دەفەرموێ : ﴿ كل من عليها فان ويبقى وجه ربك ذوالجلال والإكرام﴾

واتە/ هەموو ئەو گیان لەبەرانەی کەخوای گەورە دروستی کردوون دەبێت بمرن وتەنها پەروەردگار ی خاوەنی ڕێزو بەرزی دەمێنێتەوە.

ج) مرۆڤی باوەڕدار گەیشتۆتە ئەو ڕاستیەی کە دنیا کێڵگەی چاندنی کردەوەیەو وەك هۆڵیتاقی کردنەوە وەهایە ، لەبەر ئەم خاڵە گرنگە هەوڵی سەرەکی نابێتە کۆکردنەوەی گەورەترین سەروەت و سامانی دنیا و هەوڵ نادات کە نەمرێت بەڵکو گەورەترین کاری سەرەکی دەبێتەدانانی توێشوی تەقواو خواویستی بۆ ئەوەی لەدوارۆژدا پاداشتی بدرێتەوە ئەویش بە(نەمری ناوبەهەشت ونعمەتەنەبڕاوەکانی) ﴿وتزودوا فإن خير الزاد التقوى﴾ .

د) پاشان ئێمەی باوەڕدار وقیامەت ویست دەزانین کەوا نەمری ڕاستەقینە و سەروەت و سامانی نەبڕاوە تەنها لەبەهەشتدایەو لەدنیا کەس ئەوەی دەست ناکەوێت ﴿والآخرة خـــير وأبقى﴾

٩) کاتێ ئادەم بە وەسوەسەی شەیطان یادی خـوای گـەورەی لـەبیر برایـەوە وتـەماعی ئەوەی خرایە بـەردەم کـە ئەگـەر لـەو دارە بخـوات ئـەوە هـەرگیو نـامرێتو دەبێتـە خـاوەنی ملکێکی نەبڕاوە ، هەڵسا بەخواردنی بەری ئـەو ئـەو دارەی کـەلێی قەدەغـە کرابـوو ، خـوای گەورەش لەحەقی ئەم ڕوداوەدا دەفەرموێت ﴿ ولقد عهدنا إلى آدم من قبل فنسي و لم نجد لـــه عزما﴾ (طه :١١٥)

واتە/ لەسەرەتادا پەیمانمان لەئادەم وەرگرت کە نزیکـی بـەری ئـەو دارە نەکەوێتـەوە ، بەڵام ئادەم لەبیری چویەوە و خۆگر نەبوو لەسـەر پەیمانەکـەی خـۆی ، ئـەم ڕوداوەش دوو لایەنی ناوەکی مرۆڤەکان بەشێوەیەکی گشتی باس دەکات کە بریتی‌یە:

أ) لەبیر چوونەوە (النسیان) : بێگومان بیرچوونـەوە یەکێکە لـەو سیفەتە ناوەکیانـەی کەلـە هـەموو مرۆڤێکـدا هەیـەو تەنـها خـوای گـەورە ئـەم سـیفەتەی تێدانی‌یەهـەروەك دەفەرموێت:﴿ وماكان ربك نسيا ﴾ واتە / ئەی محمد (ﷺ) پەروەردگاری تۆ تووشی لـەبیر چوونەوە نابێت.

بەڵێ بیر چوونەوە چەندە زیان لەمرۆڤەکان دەدات لەهەمان کاتیشدا ئەوەندە سود یان پێ دەگەیەنێت چونکە گەر إنسان ڕوداوە ناخۆش و ناڕەحەتیە کانی لەبیر نەچوایە وە ئـەوە ژیری لەدەست خۆی دەداو بەردەوام لەخەفەت و دڵ تەنگیدا دەژیا .

ب) ولم نجد عزما : واتە ئادەم خۆگر و بەردەوام نەبوو لەسـەر پەیمانەکـەی کە بـەخوای گەورەی دابوو ن ئەمەش ئەوەمان تێ دەگەیـەنێت کـە مرۆڤـەکان هەرچـەندە بـەهێزو بـەرێز ونزیك بن لەپەروەردگاریان هەرتووشی لاوازی و سەرپێچی ولادان دەبن، کاتێ خـوای گـەورە نموونەی خۆنەگری و لاوازی ئادەم باس دەکات تەنـها پەیوەستی ناکـات بـە خـودی ئـادەم خۆیەوە بەڵکو ئەم لاوازی و پەیمان نەبردنە سەرە خـوی زۆربـەی زۆری مرۆڤەکانـە هـەروەك

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وخلق الأنسان ضعيفــا﴾.. واتـە: مرۆڤمـان دروسـت کـردووە بەڵام زۆر لاوازو بێ دەسەڵاتە.

کەواتـە لامانشـتێکی سـەر سـوڕ هێنــەر نـەبێت کەدەبیسـتین کەسـێکی بـاوەڕداری لەخواترس فلانە هەڵەو تاوانی کرد چونکە هەر چی بێت مرۆڤە ، مرۆڤیش قابیلی هەڵەو کـەم و کوڕی و لەبیرچونەوەو تاوانە و لەنێوان دوو جـۆر دروسـت کـراوی خـوای گـەورەدا دانـراوە (مەلائیکەت و جنۆکـە) ئەگـەر تـاوانی نـەکردوو زیـاد لەسنووری خـۆی بەندایـەتی و یـادی پەروەردگاری کرد ئەوە دەچێتــە ریـزی مەلائیکەتـەوە ، بەپێچەوانەشـەوە گـەر زۆر ڕۆ چـوو لـەتاوان و خراپـە کـاریدا ئـەوە دەچێتـە ریـزی جنۆکـە شـەیطانیەکانەوە، بـەڵام مـرۆڤ نـە ئەوەندە پاکە کە هەرگیز تاوان نەکات و بڵێـت مـن فریشـتەم چونکـە مـرۆڤ نەفـسی هەیـەر بەردەوام فەرمانی پـێ دەکـات بەرامبـەر بەخراپـە نەئـەوەندەش خراپـەکارو دوور لەخوایەکە بڵێـت مـن شـەیطانم چونکـە هـەموو کەسـێ مەلائیکـەتی لەگەڵدایـە و فـەرمانی پـێ دەکـەن بەچاکە خوازی ورەوشت بەرزی .

١٠) لەسـەرەتا باسمـان کـرد کاتـێ ئـادەم و حـەوا هەڵـسان بـە خواردنـی بـەری ئـەو درەختەی کەلێیان قەدەغە کرابوو عەورەتیان دەرکەوت و بەرگ و پۆشاك بەبەریانەوە نەما، گەر علەتی ئەم ڕوداوە وەربگرین سەیر دەکەین لـەم سـەدەی خۆشمـاندا هـەمان حاڵـەت لـە دووبارە و سێ بارەوە بوندایە بەم جۆرەی خوارەوە .

ئادەم و حەوا عەورەتیان بەوە دەرکەوت کەبێ فەرمانی خوای گـەورەیان کـردو شـوێن شەیطان کەوتن ، ئەمرۆش دەیان و سەدان هەزار کەس بەتایبەتی ئافرەتـان پاشـان پیـاوان عەورەتیان بەدەرەوەیە و خۆیان ڕوت کردۆتەوە بۆ مەبەستی ئەوەی خەڵکی سەیریان بکات ئەویش بە لەبەر کردنی جلی تەسك وڕوون و کورت کە سەرجەم گیان یان خـەڵکی دەی بینـێ ئەمەش هۆکارەکەی دەگەڕێتەوەبۆ ئەوەی کەلە فـەرمانی خـوای گـەورە لایـان داوەو بـەرگی شەرعی وپۆشاکی عـەورەت داپۆشـەر لەبـەر ناکـەن و بەکۆنەپەرستی ودواکـەوتوی دەزانـن وشوێن وەسوەسەی شەیطانی مامۆستاو دوژمنیان کەوتون ! !

کەواتە لەهەر سەردەمێکدا مرۆڤەکان لەفەرمانی پەروەردگاریان دەربچن ئەوە ئەو بێ ئابڕوی و ژیانە ناخۆشە دەبینن وپاشان گیرۆدە دەبن بەدەستیەوە.

١١) کاتێ ئادەم و حەوا هەڵسان بەخواردنی بەری ئەو درەختەی لێیان قەدەغەکرابوو خوای گەورە پێی ڕاگەیاندن کە پێم نەوتن کەشەیطان دوژمنێکی سەر سەخت و ئاشکراتانە ؟! لەم کاتەدا ئادەم وحەوا هەستیان بەهەڵەی خۆیان کرد دەست بەجێ دەستیان بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و بەیەك دەنگ ووتیان ﴿ ربنا ظلمنا أنفسنا وإن لم تغفر لنا وترحمنا لنكونن من الخاسرين ﴾ گەورەترین پەند وئامۆژگاری لەم حاڵەتە کەوەری بگرین بریتییە لەوەی کەسەرجەم پێغەمبەران لەگەڵ تووشی نارەحەتیەك یان هەڵەیك بوون دەست بەجێ پەیوەندیان کردۆتەوە بەپەروەردگاریانەوە و پەشیمانی خۆیان دەربریوە هەروەك - نوح کەداوای کرد کوڕەکەی نەخنکێ و پاشان پەشیمان بویەوە ، هەروەك یونس کە بێ پرسی خوای گەورە گەلەکەی بەجێ هێشت و پاشان لەناو دەمی حوتەکەدا پەشیمان بویەوە .

پاشان موسا (علیه السلام) لەکوشتنی کابرای ( قیبطیدا ) ولەدوایدا پەشیمان بویەوە و داوای لێ خۆشبونی کرد لەخوای گەورە و هەروەها هەموو پێغەمبەرانی تریش بەم جۆرە بوون(سەلامی خوای گەورەیان لێبێت) .

١٢) خوای گەورە کاتێ فەرمانی کرد بەئادەم و حەوا دابەزنە سەر زەوی پێی فەرموون : گەر هەرکەسێ شوێن بەرنامەی من بکەوێت ئەوە هەرگیز تووشی گومرایی و سەرگەردانی نابێت ، بەڵێ دەست گرتن بەدینی خوای گەورەوە تاکەرێگەیەکە بۆ چارە سەری کێشەکان لەدنیادا ، مانای ڕزگار بونە لەدوارۆژدا گەر سەیرێکی کێشەکانی ئەمرۆی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بکەین دەگەینە ئەو ئەنجانەی کەسەرجەم گرفت و کێشەکانیان سەر لە بێ دینی ودەست بەردان لەهیدایەتی خوای گەورەوە دەردەچێت کە گەورەترین کێشەی ئەمرۆ لەدنیادا بریتییە لە پەیداکردنیپارەو سەرمایەیەکی زۆرو هەوڵ دان بۆ نەمردن و تەمەن درێژی لەسەر کورسی فەرمان ڕەوای– هەروەك لەوەوپێش باسمان کرد –بەڵام دەست گرتن بەدینی خوای گەورەوەهیچ یەك لەم کێشانە ناهێڵێت و بنەبڕی دەکات و ژیانی زۆر سادەو

ئاسودە بۆ مرۆڤەکان دروست دەکات ، هەربۆیە قورئان دەربارەی ژیانی ئەوکەس و کۆمەڵانە دەدوێو دەفەرموێ:

﴿ومن أعرض عن ذكرى فإن له معيشة ضنكا ونحشره يوم القيامة أعمى ...﴾ (طه: ١٢٤)

واتە/ هەرکەسێ پشت لەدینی من بکات و دژیو ستێ ئەوە لەژیانێکی زۆر تەسك و ناخۆشدا دەی ژێنم وپاشان لەڕۆژی دوایشدا بەکوێری کۆی دەکەمەوە و پرسیاری لێ دەکەم

## چەند ڕوون کردنەوەو سەرنجێك لەبە سەرهات و باسەکانی بەندی دووەم

بێ گومان هەندێ مەسەلە لەو ڕوداوە بونەتە پرسیارو گرفت لەبیرو بۆچونی خەڵکیدا لەبەرامبەر بەژیانی ئادەم پێغەمبەر ( سەلامی خوای لێبێت) کە(إن شاء الله) بەکۆمەکی پەروەردگار بەپێی توانا وەڵامیان دەدەینەوەکەبریتین لەمانە:

أ) ئەو بەهەشتە ی ئادەمی تێدابوو هەر ئەو بەهەشتەیە کە لەڕۆژی دواییدا بۆ باوەڕداران ئامادەکراوە ؟!

ب) ووشەی ( شە یطان) مانای چیەو لە چیەوە هاتووە ؟!

ج) ئایا لەپێش ئادەمدا خەڵکی تر لەسەر زەوی ژیاوە ؟!

وەڵامی پرسیاری یەکەم:

بەڕاستی زانایان جیاوازیەکی زۆر هەیە لەنێوانیاندا دەربارەی ئەو بەهەشتەی ئادەم و حەوا ی تێدابوون وپاشان لێی هاتنە دەرەوە ، هەندێ لەزانایان دەڵێن ئەو بەهەشتە هەمان بەهەشتە کەلەڕۆژی دواییدا بۆ باوەڕداران ئامادەکراوە بەڵگە شیان لەسەر ئەم بۆ چوونە یان بریتیە لەو ئایەتەی کە دەفەرموێت :

﴿قلنا اهبطوا منها جميعا﴾ .. واتە : هەمووتان دابەزنە خوارەوە ، هەروەها دەڵێن لەئایەتەکەدا ووشەی ( هبـوط) هاتووە کەواتە مانای ئەوە دەگەیەنێت کە لەبەهەشتی ئاسمان بوون وپاشان فەرمانیان پێ کراوە بەدابەزین بۆ سەر زەوی ، بەڵام ئەم بۆ چوونە هەڵەیە چەنکە ووشەی (هبوط) بەمانای گواستنەوە دێت لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر

هەروەك خوای گەورەدەفەرمویت : ﴿إهبطوا مصرا فـإن لكـم ماسـألتم﴾ كەواتـە ئێستا ڕاوبۆچونی تەواو دەربارەی ئەو بەهەشتە ئەوەیە كەلە سەر زەوی بووە و ئەو بەهەشتە نیە كە لەڕۆژی دواییدا بۆ باوەڕداران تەرخان كراوە بەپێی ئەم بەلگانەی خوارەوە.

١) لەسەرەتادا خـوای گـەورە ئـادەمی لەسـەر زەوی دروسـت كـردوو بەمەلائیكەتـەكانی فەرمووی﴿ إنی جاعل في الأرض خليفة ﴾ پاشان لـەهیچ جێگایـەكدا چ لـەقورئان وچ لەسونەت باسی ئەوە نەكراوە كە (ئادەم) لـەپاش دروسـت گردنـی لەسـەر زەویـدا بەرزكراوەتـەوە بـۆ ئاسمان و پاشان بۆ بەهەشت !

٢) ئەگەر لەزەویەوە ببرانایەبۆ بەهەشت ئەوە خوای گەورە پـێی نەدەفەرموون :
﴿ اسكن أنت وزوجك الجنة﴾ ..واتە : ئەی ئادەم خۆت و ژنەكەت دابنیشن و جێگیر ببن لـە بەهەشتدا .

٣) ئەو بەهەشتەی لەڕۆژی دواییدا بۆ چاكە كاران ئامادەكراوە تەنها مرۆڤی لەخوا تـرس و باوەڕدار تێی دەچێ كەواتە شەیطان چۆن توانی بچێتە ناویەوە و وەسوەسە بۆ ئادەم و حەوا دروست بكات ؟!

٤) لەبەهەشتدا هیچ شتێ قەدەغە نیە و خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ لهـم مايشـاءون فيـها﴾.. واتـە: ئـەوەی بەهەشـتیەكان بیانـەوێ لەبەهەشـتدا دەسـت دەكـەوێت ، یـان دەفەرموێت ﴿ وفيها ماتشتهيه الأنفس وتلذ الأعين وأنتم فيها خالدون﴾ (الزخرف:٧١)

واتە:ئەوەی دەرونی مرۆڤەكان حەزی لێ بكات وچاویان خۆش حـالبێت بـەبینینی ئـەوە لەو بەهەشتەدا هەیە و هەرگیز ئێوە كە كرانە بەهەشتەوە مردن بەسـەر تـاندا نایـەت و هـەتا هەتا یە تێیدا دەژین .

كەواتە چۆن خواردنی بەری ئەو درەختە لەئادەم وحەوا حەرام و قەدەغە كرا ؟

٥) مرۆڤە باوەڕدارەكان كاتێ كرانە ناو بەهەشـتەوە هیـچ تـەكلیفیان لەسـەر نـامێنێت و بەئارەزوی خۆیان چیان بوێت ئەنجامی دەدەن كەواتە چۆن ئادەم وحەوا تـەكلیفیان لێ كـرا بەنەخواردنی بەری ئەو درەختە؟!

٦) لەبەهەشتدا تاوانی تێداناکرێت ، کەواتە ئادەم و حەوا چۆن ئەم گوناهەیان کرد ؟!

٧) مرۆڤی باوەڕداران کاتێ کرایە بەهەشتەوە هەرگیز نامێنرێتەوە دەرەوە وەك قورئـان دەفەرموێت ﴿وماهم منها بمخرجين﴾

واتە : کاتێ باوەڕدار کرانە بەهەشتەوە نامێنرێنەوە دەرەوە کەواتە ئادەم و حەوا چـۆن هێنرانەوە دەرەوە؟!

ئەمانەو چەندین خاڵی تر بەڵگەی بەهێزن لەسەر ئەوەی کە ئـەو بەهەشـتە بـاخێك بـووە لەسەر زەویدا و ئادەم و حەوای تێدا تاقی کراونەتەوە. (والله أعلم بالصواب) خوای گەورەش زاناترە بەڕاست ی ئەم باسە.

پاشان ووشـەی ( جنـة ) لـەزمانی عـەرەبیدا بـەباخ و باخـات دێـت هـەروەك لەسورەتی (الكهف) دا لەباسی گفت وگۆی پیاوە دەولەتدارە بێ باوەڕەکە وپیاوە هەژارە باوەڕدارەکـە دا هاتووە و دەفەرموێت:

﴿واضرب لهم مثلا رجلين جعلنا لأحدهما جنتين من أعناب ...﴾ (الكهف:٣٢)

وەڵامی پرسیاری دووەم : ئایا ووشەی شەیطان لەچیەوە هاتووە؟!

(طەبـەری) دەفـەرموێت : هـەر جــۆرە دروســت کراوێکــی خــوای گــەورە گــەر لەفەرمانی پەروەرگاریان دەرچوون وپشتیان هەڵکرد ئـەوە دەبنـە شـەیطان جـا جنۆکـە بـن یان ئینسان [1]

کەواتە هەرکەسێ لەفەرمانی پەروەردگاری دەرچوو پاشان پشتی هەڵکردو خۆی بـەزل زانـی و ملی نەدایە فەرکانەکانی ئەوە پـێی دەوترێت شـەیطان هـەروەك خـوای گـەورە لـەقورئاندا باسی شەیطانی کردوە لەگرۆهی جنۆکەو ئادەمیزادەکان و دەفەرموێت ﴿ شياطين الإنـــس والجن ﴾

(١)حقيقةالشيطان بالمنظور القرآني /شاكر عبد الجبار

وەلامی پرسیاری سێهەم / ئایا لەپێش ئادەمدا خەلکی تر لەسەر زەوی ژیاوە؟!

هەندێك لەمێژوو نوسان باوەڕیان وایە کە لەپێش ئادەمەوە مرۆڤی تر ژیاون لەسەر زەوی ، بەلام قسەکەیان بێ بەلگەیە ، پاشان خوای گەورە باسی ئەوەی نەکردوە و ئاماژەی بۆ ئەوە نەکردوە کە مرۆڤ لەپێش ئادەمەوە هەبوبێت لەسەر زەوی ، خۆ ئەگەر هەبوبێتیش ئەوە شتێکی سەر سوڕهێنەر نیە.

پرسیار/ ئایا جۆری ئەو دارە چیبوو کەلەبەهەشتدا لەئادەم و حەوا قەدەغەکرا؟!

وەلام / هەندێ لەخەلکی دەلێن (گەنم) بووە؟!بەلام/ ئایا گەنم لەدار دێتە دەرەوە یان دانەوێلەیە؟! کەواتە ئەم قسەیە بناغەیەکی نیە ، بەلام ڕاسترین بۆ چوون و قسە لەم بارەوە ئەوەیە کە بلێین ( هەلبەتە ئەگەر دەرس و ئامۆژگاری وسود لەباس کردنی جۆری ئەو درەختەدا هەبوایە ئەوە خوای گەورە باسی لێوە دەکردوو بۆی ڕوون دەکردینەوە ، بەلام وادیارە باس کردنی ئەو دارە هیچ سودێکی نیە هەر بۆیە باسی لێوە نەکراوە)

پاشان نەك ئەمە بەلکو زۆر مەسەلە هەیە لە قورئاندا پێویست بەوە ناکات کەبەشێوەیەکی زۆر ڕون و ئاشکرا باس بکرێت چونکە سودێکی وای نیە و پاشان باس کردنە گەشی مەبەستی سەرەکی نیە لەو مەسەلەیەدا بەلکو مەبەستە سەرەکیەکە شتێکی ترە.

بەهەمان شێوە باس کردنی جۆری ئەو درەختەی بەهەشتیش مەبەستی سەرەکی ڕوداوەکەنیە بەلکو خوای گەورە هەر بۆ ئەوەندە بۆمان باس دەکات کەبزانین و تێ بگەین کە لەبەهەشتدا دارێکی بەردار هەبووەو لەئادەم و حەوا قەدەغە کراوە بۆ مەبەستی تاقی کردنەوەیان ، خۆ ئەگەر بلێین ئەو دارە (سێو بووە یان هەنار یان پرتەقاڵ یان قەیسی و...) چ لە باسەکە دەگۆڕێت وسودی چیمان پێ دەگەیەنێت ؟!

پرسیار/ ئایا ئادەم هەڵسا بەو سەرپێچیە یان حەوا پێی ئەنجام دا؟!

وەڵام/ زۆرێك لەخەڵكی مسوڵمان و نامسوڵمان واتێ گەیەنراون كە حەوا بوەتە هۆكاری دەركردنی ئادەم لەبەهەشت و گەر حەوا نەبوایە ئەوە ئێستەش ئادەم و نەوەكانی لەبەهەشت دەمانەوە و هەرگیز دۆزەخیان نەدەبینی؟!

بەڵێ ئەمەگو مانێكە دەیان و سەدان ساڵە بەناو خەڵكیدا بڵاو بۆتەوە ، بەداخەوە هەندێ لە مسوڵمانە تێ گەیشتوەكانیش هەمان بیرو باوەڕیان هەیە . بەڵام لەڕاستیدا وانیە و ئەم بیرو باوەڕە هەڵەیە لەتەوراتی دەست كاری كراوی جولەكەكاندا هاتووە ، گومانیشی تێدانیە كە تەورات لەلایەن جولەكەوە دەست كاری كراوە و هەزارەها قسەی پڕو پوچ و درۆیان تێ خزاندوە هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ من الذین هادوا[1] یحرفون الكلـم عن مواضعه﴾ (النساء : ٤٦)

واتە: هەندێ لە جولەكە هەڵسان بەدەستكاری كردن و گۆرینی ووتەكانی خوای گەورەو دانانی قسەی خۆیان لەجێگە كەیدا.

پاشان گەر سەیرێكی قورئان بكەین ئاماژە بۆ ئەو ڕاستیە دەكات كە ئادەم دەست پێشخەر بووە لەو سەرپێچی كردنەدا هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وعصى آدم ربه فغـوى﴾ واتە: ئادەم لەپەروەردگاری عاصی بوو بەهۆیەوە ڕێی ڕاستی لێ وون بوو.

---

(١)الهادوا: الیهود.

# بەندی سێهەم
# چیرۆکی هابیل و قابیل

(هابیل و قابیل ) دوو کوڕی ئادەم بوون وقورئان چیرۆك و بەسەرهاتی مان بۆ باس دەکات بۆ مەبەستی گەیاندنی سودو ئامۆژگاری بەباوەڕداران .

بەڵێ هابیل کە یەکێ بوو لەکوڕەکانی ئادەم زۆر چاك وئارامگرو گوێ ڕایەڵ بوو هەر لەبەر ئەم سیفەتە بەرزانەی بوو کرابووە شوانی مەڕو ماڵات.

بەپێچەوانەشەوە قابیل کەیەکێکی تر بوو لەکوڕەکانی ئادەم زۆر دڵ ڕەق و لار بوو بەردەوام حەزی بەسەر پێچی و بێ فەرمانی دەکرد ، هەربۆیە کاری زەوی کێڵان و جوتیاری دەکرد .

ڕۆژگار ڕۆیشت و ئادەم و نەوەکانی ژیانیان بەسەر برد تا لە ناکاودا (هابیل و قابیل) دژایەتیەك لەنێوانیاندا دروست بوو ، زانایان دەربارەی ئەم دژایەتیەی نێوان (قابیل و هابیل) دووجۆر بۆچوونیان هەیە .

**یەکەم:** لەسەرەتای ئەم باسەدا ووتمان (هابیل) خەریکی شوانێتی بوو هەروەها (قابیل) خەریکی جوتیاری بوو ، هەریەکەیان هەڵسان بەخێر کردنێك (هابیل) مەڕێکی زۆر جوان و لەش ساغ و قەڵەوی هێناو لەسەر شوێنێکی بەرز دای ناو، (قابیل) یش لەکێڵگەی خۆیدا کام بەرو بومەی زۆر رزیوو بێ کەڵك بوو هێنای و ئەویش لەسەر تەپۆڵکەیەك داینا ، لەم کاتەدا ئاگرێك لەئاسمانەوە هات و مەڕەکەی (هابیل)ی بردوو بەرو بومە خراپەکەی (قابیل)ی لەشوێن خۆیدا بەجێ هێشت ، ئا بەم ڕوداوە دا زانیان کە ئەو خێرو قوربانیەی کردوویانە لە ( هابیل ) قبوڵ کراوە لای خوای گەورە وەو لە(قابیل) قبوڵ نەکراوە.کاتێ ئەمە ڕویداو( قابیل) ڕقی لە(هابیل) ی برای هەڵگرت و هەڵسا بە کوشتنی ، هەروەك قورئان ئاماژەی بۆ کردووە.

**دووەم:** هەندێکی تر لەزانایان دەڵێن : کاتێ ئادەم بەتەواوی لەسەر زەویدا جێگیر بوو هەڵسا بەکاری ژن ومێردایەتی لەگەڵ حەوادا ، پاشان حەوا سکی یەکەمی داناو کوڕو کچێکی بوو هەروەها بۆ جارێکی تریش حەوا سکی پڕ بوو و کوڕو کچێکی تری بوو ، ئادەم بۆ مەبەستی زۆر بوونی نەوە لە سەر زەویدا هەڵسا بەوەی کە فەرمان بکات ئەو کچەی کەلەگەڵ هابیل دابوو (قابیل) بیکاتە ژن و خێزانی خۆی و هەروەها ئەو کچە ی کەلەگەڵ (قابیل) دا بووە با (هابیل) بیکاتە ژن و خێزانی خۆی ، سەرەنجام (هابیل) ڕازی بوو بەم فەرمانە بەڵام (قابیل) ی کەللە ڕەق سەرپێچی ئەم فەرمانەی کردوو دژی وەستاو ملی بۆ نەداو ووتی:خوشکی من جوانتر و چاکترەو لەگەڵ خۆمدا لەدایك بووە کەواتە دەبێت بۆ خۆم بێت و خوشکی خۆت بۆ خۆت .

پاشان ئادەم بۆ چارە سەری ئەم کێشەیە فەرمانی پێ کردن بەوەی هەریەکەتان خێرو قوربانیەك بکەن گەر لەهەر کامتان وەرگیراو قبوڵ کرا ئەوە بابەقسەی ئەو بێت و ئەوی تریان دەبێت گوێ ڕایەڵی بێت ، پاشان خێرو قوربانیەکە لە(هابیل) وەرگیراو لە(قابیل) وەرنەگیرا و (قابیل) بەم کارە زۆر و زیاتر ڕقی ئەستور بوو لە(هابیل) ی برای سەرەنجام کوشتی.

قورئان ئاماژە بۆ ئەم ڕوداوە دەکات و دەفەرموێت:

﴿ واتل عليهم نبأ إبني آدم بالحق إذ قربا قربانا فتقبل من أحدهما ولم يتقبل من الآخر قال لأقتلنك قال إنما يتقبل الله من المتقين ، لئن بسطت إلي يدك لتقتلني ماأنا بباسط يدي إليك لأقتلك إني أخاف الله رب العالمين ، إني أريد أن تبوأ بإثمي وإثمك فتكون من أصحاب النار وذلك جزاء الظالمين ، فطوعت له نفسه قتل أخيه فقتله فأصبح من الخاسرين ﴾ (المائدة:٢٧ -٣٠)

واتە: ئەی محمد بۆیان باس بکە دەنگ و باسی کورەکانی (ئادەم) بەڕاستی کە هەردووکیان قوربانیەکەیان کردوو لەپاشاندا لەیەکێکیان وەرگیراو لەوی تریان وەرنەگیرا کە(قابیل) بوو بەو براکەی تری ووت کە(هابیل) بوو دەت کوژم ! !لەوەلامدا (هابیل)

بە(قابیل) ی ووت : خـوای گـەورە لـە خواترسـەکان (المتقـین) قوربانی و خێر وەردەگرێ پاشان پێی ووت: ئەگەرتۆ دەستم بۆ درێژ بکەیت بۆ ئەوەی بم کوژی ئەوە من هەرگیز دەستت بۆ درێژ ناکەم کەبت کوژم چونکە من لەپەروەرگاری جیهان دەترسم.

من دەمەوێ گوناهی تۆ نەیەتە ملی من ، بەلکو ئەمەوێ گوناهی منیش و گوناهەکانی تریشت لەسەر کەڵکە ببێت بۆ ئەوەی ببێتە هاوڕێی ئاگری دۆزەخ کەبەڕاستی دۆزەخ پاداشتی تاوانبارانە.

پاشان قابیل دەستی درێژ کرد بۆ( هابیل) ی بێ تاوان و لەخواترس و کوشتی بەم کارەشی قابیل بوو بەیەکێ لەزەرەر مەندەکان.

بەڵێ قابیلی شەیطان پەرست بۆ یەکەم جار لەسەر زەویدا تاوانی کوشتنی داهێنا و برا بێ تاوان و با وەرپدارەکەی خۆی کوشت ، بەڵام کاتێ کوشتی نەیدەزانی چی لەتەرمەکەی بکات ، هەرچەند بیری دەکردەوە و سەری دەهێنا رێگەیەکی نەدەدۆزیەوە کە تەرمی براکەی بشارێتەوە و لەبەر چاوان ونی بکات ، بەڵام لەم کاتەدا خوای گەورە نایەوێت ئەو لاشە پاك و بێ تاوانەی هابیل لەسەر زەوی کرم تێی بدات و ئاژەڵە درندەکان بەمردوویی بیخۆن ، هەر بۆیەلەم کاتەدا خوای گەورە قەلەڕەشێکی ناردو پیشانی (قابیل) ی دا کەبەدەنوك چاڵی بۆ قەلە ڕەشێکی مردارەوە بوو هەڵکەندو پاشان قەلە ڕەشە مردارەوە بوەکەی تێ کردوو خۆڵەکەی دایەوە بەسەردا،قورئان دەربارەی ئەم ڕووداوە دەفەرموێت:

﴿فبعث الله غرابا يبحث في الأرض ليريه كيف يوري سوءةأخيه قال ياويلتى أعجـزت أن أكون مثل هذا الغراب فأواري سوءة أخي فأصبح من النادمين ﴾ (المائدە: ٣١)

## چەند پەندو ئامۆژگاریەکی گرنگ لەم باس و بەسەر هاتەدا

(١) هەروەك باسمان کرد یەکێ لەو هۆکارانەی بوە هۆی دژایەتی لەنێوان هابیل و قابیل بریتی بوو لەوەی کە ئەو خێرو قوربانیەی کە هابیل کردی لەلایەن خوای گەورەوە لێی قبوڵ کراو بەپێچەوانەشەوە خێرو قوربانیەکەی قابیل وەرنەگیراو درایەوە بەسەرو چاویدا ، جالێرەدا پرسیارێك دروست دەبێت کەبریتی‌یە لە:

ئایا بۆ ئەو قوربانیە لەهابیل وەرگیراو لەقابیل وەرنەگیرا؟!

ئایا خوای گەورە ڕقی لەقابیل بوو هابیلی خۆش دەویست ؟!

ئایا چ یەکێ لەم خاڵانە بووە هۆکاری سەرەکی بۆ وەرنەگرتنی قوربانیەکەی (قابیل)؟

لەوەلامدا دەلێین:

أ)مەرجی وەرگرتنی خێرو قوربانی لای خوای گەورە بریتیە لە(تەقوا)هەروەك لەئایەتەکەدا و لەسەر زمانی هابیلەوە ئامازەی بۆ کراوە و دەفەرموێت ﴿ إنما يتقبل الله من المتقين ﴾.. واتە: خوای گەورە خێرو قوربانی لەکەسێ وەردەگرێ کە خاوەنی تەقوابێت ، تەقواش مانایەکی گەورەو فراوانی هەیە کە بەمانای لەخواترسان وخۆپاراستن لەگوناە و بۆ خوا گونجاندن ورازی بوون بەبەشی کەم و کارکردن بەقورئان و خۆ ئامادەکردن بۆ ڕۆژی دوایی دێت هەروەك لەئیمامی (عەلی )یان پرسی دەربارەی تەقوا ئەویش لەوەلامدا بەم جۆرەی وەلام دایەوە.

بەڕاستی تەقوا بناغەی سەرجەم کارو بانگەوازو خێرو قوربانیە کە ، بەو واتایەی ئەو کەسەی کەدەستی دایە هەرکارێکی خێر تەقوای لەگەڵ دابوو ئەوەدڵنیا بێت کەخوای گەورە لێی قبوڵ دەکات هەروەك چۆن خێرو قوربانیەکە لە (هابیل) قبوڵ کرا . زۆر کەس واگومان دەبەن کە ئەو کەسەی قسەکانی کاریگەرەو ووتاربێژێکی سەرنج ڕاکێشەرە تەنها پەیوەندی بەزانست و زیرەکی ئەوکەسە هەیە ، بەلام لەڕاستیدا وانیە چونکە زانست و زیرەکی چەندە پێویستە بۆ قسە کردن و کارکردنە سەر خەڵکی ئەوە تەقواو لەخوا ترسان لە ناخی ئەو کەسەدا دە ئەوەندە پێویستە. هەر بۆیە زۆر کەس دەبینیت کەکاتێ خێردەکات یان نامیلکەیەك دەنوسێ یان قوربانیەك دەکات یان دەرسێك دەلێتەوە زۆر شوێنی خۆیان ناگرن و سودێکی ئەوتۆ ناگەیەنن بەو کەسانەی کەئەمان بەحسابی خۆیان سودیان پێ گەیاندون و ئامۆژگاری خێران کردوون بەمەرجێك لەهەمان کاتیشدا پارەیەکی زۆریان بەخشیوە یان زۆر زیرەکن بەلام کاری گەریان لەسەر ژیری ودڵی خەڵکی نیە ، کەئەمەش

هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە(تەقوا) لەدڵ و ناخیاندا ڕەگی دانەکوتاوەو چەندە بۆ خوا ی گەورە ئەوخێرە دەکەن ئەوەندە و زیاتریش لەوە بۆ دنیاو سوپاسی خەڵکی دەکەن.

(ب) یەکێکی تـر لەمەرجـەکانی قبـوڵ کردنـی خـێرو قوربـانی و چاکـە خـوازی بریتـیـە لەوەی کە کام شتەیماڵەکەت زۆر خۆشەویستە ئەوەبکەین بەخێرو قوربـانی هـەروەك چـۆن (هـابیل) لەگـەڵ ئـەوەی کەبەتـەقواو لەخواترسـانەوە قوربانیەکـەی ئـەنجامدا باشـترین و چاکترین مەڕی هێناو کردی بەقوربانی ، بەپێچەوانەشەوە نەك وەك (قابیل) کـەپیس ترین و بێ کەڵك ترین و بەروبومی باخەکەی کردە قوربـانی هـەر بۆیـە لەئـەنجامدا لێی قبـوڵ نـەکرا چونکە تەقوای لەگەڵ دانەبوو هەروەها ئەوەی کردیشی بـەخێر بـێ کـەڵك و بـێ سـوود بـوو خوای گەورە لەبارەی ماڵ بەخشین و قوربانیەوە دەفەرموێت :

﴿ لن تنالوا البر حتى تنفقوا مما تحبون وما تنفقوا من شيء فإن الله به عليم ﴾ (آل عمران : ٩٢)

واتە : هەرگیز ناگەنـە چاکـەو چـاك نـابن تـا لـەو شتە نەبەخشـن کە خۆشـتان دەوێـت وەهەرشتێکتان کرد بەخێرو ئەوە خوای گەورە پێی زانایە .

(٢) بەڕاستی تەقوا تەنـها قسـەی سـەر زوبـان نیـە و دروشـم بـەرز کردنەوەنیـە بـەڵکو تەقوا ئەوەیە کە( ماوقر في القلـــب وصدقـــه العمـــل ) واتـە: لـەدڵدا جێگـیر ببێـت و پاشان بەکردەوەش بیسەلمێنی کەبەتەقوای .

بـەڵێ هـابیل تەنـها بـەدەم خـاوەنی تەقوالەخواترسـان نـەبوو بـەڵکو بـەکردەوەش سەلماندی کە لەپەروەردگار ی دەترسێ وەهەر ئەم ترسـە وای لێکرد کـە دەسـتی نەچێتـە خوێنی (قابیل) ی برای و فەرمووی:

﴿ لئن بسطت إلى يدك لتقتلني ماأناباسط يدى إليك لأقتلك إني أخاف الله رب العالمين ﴾

٣) گومانی تێدانیـیە کاتێ مسوڵمانێك پیاو کوژێ دێتـە ڕێی نایکـات و خـۆی لێ بـەدوور دەگرێت هۆ کارەکەی ئەوەنیە دەترسێ لەخـەڵك یـان کەسـێکی لاوازو بـێ دەسـتەڵاتە بـەڵکو تاکە هۆکاری سەرەکی لەئەنجام نەگەیاندنی ئەو تاوانە بریتـیـە لەترسـان لـەخوای گـەورە ، بەڵێ هابیل زۆر باش دەی توانی بەرگری لە لاشەی خۆی بکات و پاشان قابیلی برای بکـوژێ

بەڵام لەوەڵامدا ووتی من هەرگیز دەستت بۆ درێژ ناکەم ، ئـەویش لەبەر ئەوەنیـە کـەناتوانم یان دەستەڵاتم نیە یان ترسنۆکم بـەڵکو مـن لەپـەروەردگارم دەترسـم ﴿إني أخـاف الله رب العالمين﴾ .بەڕاستی هەروەك چۆن دەبێت تەقوا و تاوان نەکردن لـەکار و کردەوەی ئینسانی مسوڵمان و باوەڕدار دا ڕەنگ بداتەوە ئاواو بەهەمان شێوەش دەبێت ترسان لەخوای گـەورە ببێتە هۆکارێکی زۆر سەرەکی بۆ دوور خستنەوەی ئەوکەسە لەتاوان کردن ، جائـەو ترسـان لەخوایە لەکاتی دیـاردابێت یـان نادیار ، بـەڵام لـەکاتی نادیـاردا پاداشـتی گـەورەتر چونکـە بەئەنجام گەیاندنی تاوان لەوکاتەدا زۆر ئاسان ترە و جگە لەخوایگەورە کەس ئاگاداری ئـەو کەسە نیە ، هەربۆیە خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرمێت:﴿ إن الذين يخشون ربهم بـالغيب لهم مغفرة وأجر كبير﴾ (الملك:١٢)

واتە: ئـەو کەسـانەی کەلەپـەروەردگاریان دەترسـن بەتایبـەتی لـەکاتی نـهێنی دا بۆیـان هەیە پاداشتێکی گەورە.

بـەڵام بەپێچەوانەشـەوە ئەوکەسانەی کـەتاوان دەکــەن و خـەڵکی بەناهــەق دەکـوژن لەپەروەردگاریان ناترسن وشەرمی لیٚ ناکەن هەروەك چۆن(قـابیل) لەپـەروەردگای نەترسا و هەڵسا بەکوشتنی (قابیل) ی برای.

کەواتە ئێستا دەتوانین گەورەترین یاسا لەم ڕووداوە وەربگرین کەبریتی‌یە لەوەی هـەموو ئەو کەسـانەی بـەدرێژایی مێـژوو خـەڵکیان چەوسـاندۆتەوە و پاشـان کوشـتویانن ئـەوەبووە کەلەپەروەردگاریان نەترساون و شەرمیان لێنەکردووە.

(٤) یەکێکی تر لەو یاسانەگرانەی کە هەر لەم ڕووداوە وەری دەگریـن بریتی‌یـە لـە وەی کەهەر کەسێك هەڵسا بەدروست کردن و بەدی هێنانی ڕێگەو بەرنامەیەکی خراپ پاشان گـەر خەڵکی بەهۆی ئەم بەرنامەو بیردۆزە خراپەوە گەر تووشی خراپەو هەڵە و تاوان بـوون ئـەوە تاوانی هەموو ئەو کەسانەی کە ئەو کارە خراپەیان ئەنجامدا وە دەچێتـە ملـی ئـەو کەسـەی کەلە سەرەتادا دامەزرێنەرو دروست کەری ئەو کـارە خراپەیـە بـێ ئـەوەی لـەتاوانی ئـەنجام دەرانی کەم بێتەوە.

هەربۆیە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((لاتقتل نفس ظلما إلا كان علـى إبـن آدم الآول كفل من دمها لأنه كان أول من سن القتل))[1] واتە: گەر کەسێ بەبێ تاوان بکوژرێ ئەوە ئەو خوێنەی دەچێتە ملی کوڕەکەی ئادەم (قابیل) ولێی بەر پرسیارە چونکە ئەو یەکەم کەس بوو کە کاری کوشتنی داهێنا.

٥) یەکێکی تر لەویاسا گرنگانەی کەهەر لەم ڕووداوە فێری دەبین بریتی‌یە لەوەی هەرکەسێك هەڵسا بەکوشتنی کەسێکی بێ تاوان پاداشتەکەی بریتی‌یە لەدۆزەخ هەروەك (هابیل) لەوەڵامدا بە(قابیل) ی ووت:

﴿ فتكون من أصحاب النار وكذلك جزاء الظالمين﴾ (المائدة:٢٩)

واتە: بۆئەوەی ببیتە هاوڕێی ئاگری دۆزەخ کەئەمەش پاداشتی تاوان بارووستەم کارانە ، هەروەها خوای گەورە دەربارەی کوشتنی مرۆڤی بێتاوان دەفەرموێت :

﴿ فمن يقتل مؤمنا متعمدا فجزاءه جهنم خالدا فيها وغضب الله عليه ولعنه وأعد له عذابـا عظيما﴾..واتە: هەرکەسێ هەڵسا بەکوشتنی باوەڕدارێك بەبێ هیچ هۆکارێك ئەوە پاداشتی بریتی‌یە لە دۆزەخ کەبەنەمری تێیدا دەمێنێتەوە و پاشان خوای گەورە ڕقی لێ هەڵدەگرێ و لەڕەحم و بەزەیی خۆی دەیکاتە دەرەوە و پاشان سزایەکی گەورەی بۆ ئامادە دەکات.

٦) بێ گومان لەهەر سەردەمێکدا دژایەتی (صراع) هەبوو بێت ئەوە دژایەتی‌یە شتێ دنیای نەبووە بەشێوەیەکی گشتی بەڵکو دژایەتی بووە لەنێوان (دروست و نادروست) دا ،(حق ، باطل) بەڵێ ئەو دژایەتیەی کەلەنێوان (هابیل و قابیل) دابوو بریتی بوو لە دژایەتی لەنێوان هەق و ناهەقدا هەربۆیە (محمد قطب) دەفەرموێت ( إن الصراع الأكبر في الحياة البشرية ليس هو الصراع السياسى ولاصراع الحربي و لاصراع الأقتصادي ولكن هذا الصراع هو صـراع بين الحق والباطل بين الإيمان والكفر )[2]

واتە: ئەو دژایەتیە گەورەیە ی کە لەناو مرۆڤە کاندا هەبووە دژایەتی نەبووە لەسەر

(١)رواه الجماعة غير أبى داود و تفسير إبن كثير ( ج٢ ص٤٥)

(٢)كيف نكتب التأريخ الأسلامى(محمد قطب)/ص٧٣

مەسەلەی سیاسی یان لەسەر مەسەلە ئابووری و عە سکەریەکان بەڵکو ئەو دژایەتیە ی نێوان مرۆڤەکان بریتی‌یە لە دژایەتی نێوان هەق و ناهەق ،ئیمان و کوفر

## بەندی چوارەم
## حیکمەت لەدروست کردنی شەیطان

زۆر جار پرسیار دەکرێت ودەوترێت :ئایا حیکمەت چی‌یە لەدروست بوونی شەیطان؟!

یان خوا گەورە شەیطانی بۆ بەدی هێناوە و تێکەڵ ناخ و دەروونی مرۆڤەکانی کردووە؟! تۆبڵێی خوای گەورە رقی لەبەندەکانی خۆی بێت و بەهۆی شەیتانەوە بیەوێت بەرەودۆزەخیان بەرێت ؟! یان گەر خوای گەورە بەهەشتی بۆ بەندەکانی ئامادەکردووە بۆچی تەمەنی درێژی داوە بەشەیتانکە بەئارەزووی خۆی هەڵسێ بەگومراکردنی بەندەکان و لادانیان لەسەر خواپەرستی و یەکتاپەرستی ؟! ئەمانەو دەیان پرسیاری تر لەمێشك و دڵی خەڵکیدا دروست بووە و بەبێ وەڵام ماوەتەوە،ئێمەش زۆر بەپێویستمان زانی کەلەسەرەباسێکی سەر بەخۆدا وەڵامێکی تێرو پڕی زانستیانەی ئەم پرسیارە بدەینەوە تا خەڵکی بزانن و تێ بگەن لەو ڕاستیەی کە کارەکانی خوای گەورە بێ حیکمەت نین و کاری بێ سەرەو بێناوەرۆك شیاوی پەروەردگاری حەکیم نیە.

هەروەها دەبێت لەوەش دڵنیا بین کەهەرشتێك لەلایەن خوای گەورەوە بڕیاری لەسەر درابێ ئەوە نیعمەتی پەروەردگارەو بۆ سوودی بەندەکانیەتی چونکە هەرگیز خوای گەورە زیانی بەندەکانی ناوێت و هەموو کات ویستی وەهایە کە بەندەکانی چاك بن و لەهەموو کارێکی خراپ و دزێو دوور بن.

بەڵێ هەر لەم ڕوانگەیەوە دەتوانین بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە بڵێین :

١) بۆ مەبەستی تاقی کردنەوە ی بەندەکان و دەرکەوتنی پلەی بەندایەتیان :

بێ گومان گەورەترین مەبەست و حیکمەت لەدرووست بوونی شەیطان بریتی‌یە لە تاقی کردنەوەی بەندەکان تاوەکو دەربکەوێ کێ بەڕاستی بەندایەتی خوای گەورە دەکات و گوێڕایەڵی فەرمانەکانیەتی و دژایەتی شەیطان و هەموو ئەو ڕیگایانە دەکات کە مرۆڤەکان

بەرەو دۆزەخ ڕەوانە دەکەن ، لەگەڵ ئەمەشدا بۆ دەرکەوتن و تاقی کردنەوەی ئەو کەسانەی کە پشتیان لە پەروەردگاریان کردووە و شەیطان یان کردۆتە چاو ساغ و مامۆستای خۆیان.

بەڵێ لەم کاتەدا ئەوە دەردەکەوێت کە کێ بەڕاستی بەندەی (الله) یەو کێ بەندەی (شەیطان)ە هەر بۆ یە قورئان لەم بارەیەوە دەفەرموێت : ﴿ فليعلمن الله الذين صدقوا وليعلمن الكاذبين ﴾ (العنكبوت: ٣)

٢) بۆمەبەستی ترسان لەتاوان کردن وسەرپێچی کردنی فەرمانەکانی پەروەردگار : ئەمیش بەوەی کەبەندەکان بیربکەنەوە لەچارەنوسی (إبليس) ی تاوانبار کە کاتێ فەرمانی پەروەردگاری شکاند چی بەسەر هات و پاشان لەڕۆژی دوایشدا بەچ جێگاو شوێنێك دەگات کە بێ گومان دۆزەخە ، ، گومانیشی تێدانیە کە ئەو فەرمانەی دەربارەی شەیطان درا لەلایەن خوای گەورەوە کەبریتی بوو لە دۆزەخ ولەڕەحم دەرچوون تەنها پەیوەست نیە بەشەیطانەوە بەڵکو یاساکە گشتی‌یەو پەیوەستە بە هەموو ئەو کەسانەی کە ڕێ ڕەوی شەیطان دەگرنە بەر و بێ فەرمانی پەروەردگاریان دەکەن.

٣) بۆ ئەوەی ببێتە پەندو ئاکۆژگاری بۆ کەسەکانی دوای خۆی زۆر جار باوکان ودایکان و پەروەردەکەران کەدەیانەوێت ئامۆژگاری منداڵەکانیان یان قوتابیەکانیان بکەن هەوڵ دەدەن نموونەی کەسێکیان بۆ باس بکەن کەلەپێش ئەمدا خراپەو تاوانێکی کردبێ و پاشان بەچارەنووسی خۆی گەیشتبێ ، بۆ نموونە : گەر بتەوێ منداڵەکەت یان قوتابیەکەت دەست پاك دەربچێت و دووربێت لەفێڵ‌و تەڵەکەبازی کردن بەرامبەر خەڵکی ئەوە نمونە ی کەسێکی دزی بۆ دەهێنیتەوە کەلەسەر دزی چۆن گیراوەو پاشان لەکوێش کوشتویانە، لەم کاتەدا ئەو منداڵە یان ئەو قوتابیە ترسێك لەدڵیدا دروست دەبێت بەرامبەر دەست پیسی چونکە لەناخیدا ئەوەی بۆ دروست بووە گەر ئەمیش دزی بکات بەهەمان ئەنجام و چارەنووس دەگات ، هەر لەم ڕوانگەیەوە خوای گەورە ویستی وەهایە کەسەرجەم بەندەکان بەبێ جیاوازی پەروەردەبکات لەسەر تاوان نەکردن و نموونە شمان بۆ دەهێنێتەوە بە شەیطان و

پێمان دەفـەرموێت : ئـەی بـەندەکانم بەخەبـەر بێنـەوە و ئاگادار بـن کەواشـەیطان لـەکاتی خۆیدا بێ فەرمانی منی کردوو پاشان منیش لەڕەحمەتی خۆم دەرم کردوو هەروەها لـەڕۆژی دواییشـدا دەیکەمـە هـاوڕێ ی ئـاگری دۆزەخ ، کەواتـە ئێـوەش ئاگادار بـن و تـاوان نەکـەن باتووشی ئەو چارەنووسە نەبن کەشەیطان تووشی بوو.

سـەرنج بـدە؟! بەڕاسـتی خـوای گـەورە زۆر بەخشـندەو لـێ بووردەیـە بەرامبـەر بەبەندەکانی چونکـە شـەیطانی بۆ کردووینەتـە پـەندو ئامۆژگـاری و بـە نموونەیـەکی واقعـی تێمان دەگەیەنێت کە خواستی بێ فەرمانی و خراپەکاری لەناخی خۆمان دەریکـەین وفـڕێی بدەین .

هەروەها فیرعەونیش (علیه اللعنة) بەهەمان شێوە کراوەتـە عیـبرەت و پـەندو دەرس لێ وەرگرتـن لەبـەردەم بـەندەکاندا تـاڕۆژی دوایـی ئـەویش بەمانـەوەی لاشـەکەی و هیـچ لێ نەهاتنی هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ فاليوم ننجيك ببدنك لتكون لمن خلفك آية ﴾ واتە: ئەمڕۆ لاشەکەتمان رزگار کرد لەغەرق بوون و ئاژەڵە درندەکانی ناو دەریا بۆ مەبەستی ئەوەی ببێتە پەند و ئامۆژگاری بۆ کەسانی دوای خۆی بەڵێ شـەیطانیش پـەندو ئامۆژگاریـە بۆ تاوان باران و ستەم کارانی دوای خۆی تارۆژی دوایی.

٤) بۆ مەبەستی ئەوەی بەندە خواناسەکان ڕێزو چاکی خۆیـان بـۆ دەریکـەوێ و خۆیـان بە کەم نەزانن: گەر بمانەوێت وەسفی شتێك یان کەسێك بکەین ئـەوە دەسـت بـەجێ نموونـە بەدژەکەی دەهێنینەوە بۆ ئەوەی ڕێزی ئەو کەسە ی یـان ئـەو شـتەمان بـۆ دەریکـەوێت بـۆ نموونە گەر یـەکێ بیـەوێت باسـی فـەضل و گـەورەیی لـەش سـاغی بکـات ئـەوە نموونـە بـە نەخۆشی دەهێنێتەوە بۆ ئـەوەی چـاکی لـەش سـاغی بـۆ خـەڵکی ڕوون بکاتـەوەو بـەواقعی تێیان بگەیەنێت یان تا مرۆڤـەکان فـەقیری نـەبینن قـەدرو ڕێزی دەوڵەمـەندی نـازانن ، یـان تامرۆڤی خراپ نەبینن ڕێزو پلەی مرۆڤی چاك و خواناس نازانین.

کەواتە مرۆڤیش تا شەیطان و شەیطان پەرستان نەبینێت ئەوە قەدرو رێزی خۆی بۆ دەرناکەوێت کە چەندە پاکەو چەندە لە پەروەردگاریەوە نزیکە ، ئەویش بەهۆی جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خوا ی گەورەوە.

٥) یەکێکی تر لەحیکمەتەکانی دروست بوونی شەیطان بریتی‌یە لەوەی کەئێمە تێ بگەین کە خوای گەورە چەندە ئارامگرە لەبەرامبەر دروست کراوەکانیدا .

بەراستی ئینسان نازانێت بەچ شێوەیەك باس لە( صبر و حلم ) ی خوای گەورەبکات چونکە ئارامگری خوا سنورێکی بۆ دیاری نەکراوە و شتێکی نسبی نیە تا مرۆڤەکان بەژێری سنور داری خۆیان باسی لێوە بکەن . هەر بۆ ئەم مەبەستە گەر سەرنج بدەین شەیطان لەگەڵ ئەو هەموو تاوان و بەدکاری و بێ باوەڕیەدا کەچی خوای گەورە تەمەنی درێژ کردووەو ڕزقی خۆی بەردەوام پێ دەبەخشێ کە گەورەترین ڕزقی خوای گەورە بریتی‌یە لەژیان و تەمەن چونکەژیان و کات فرسەتێکن خوای گەورە دەی بەخشێ بە مرۆڤەکان تاوەکو دوا ڕۆژی خۆیانی پێ بکڕنەوە.

بەڵێ زۆر کەسی تر دەبینی کە هەمان ڕێبازو کاری شەیطانی گرتۆتە بەرو ڕۆژانە هەزاران هەزار بێ فەرمانی خوای گەورە ئەنجام دەدات و دەبێتە بەربەست لەرێگەی بەرنامەی خوای گەورەداو دەیان وسەدان کەس لەساتێکداەکوژرێ کەچی لەگەڵ ئەوەشدا خوای گەورە ڕزقی دەدات و دەوڵەمەندی دەکات و ڕووکەش و ڕوخساری جوانی پێ دەبەخشێ و ماڵ و منداڵی زۆر چاکی پێ دەبەخشێ ، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت لەم بارەوە: ((لاأحد أصبر علی أذی یسمعه من الله ، یجعلون له الولد وهو یرزقهم))[1]

واتە : کەس بەوێنەی پەروەردگار ئارامی نیە بەرامبەر بەندەکان لەکاتێکدا بڕیاری ئەوە دەدەن کە خوای گەورە منداڵی هەیەو کەچی خوای گەورە ڕزقیان دەدات .

---

(١)عالم الجن والشیاطین /د. عمر سلیمان الأشقر ص١٧٤

## بەندی پێنجەم
## ڕێگاکانی شەیطان بۆ گومراکردنی بەندەکان

لەم باسەدا زۆر بە پێویستی دەزانین کە خوێنەری بەڕێز لەوە ئاگادار بکەینەوە کە شەیطان و شوێن کەوتوانی چەندەها ڕێگاو هۆکار یان گرتوەتە بەر بۆ مەبەستی گومراکردن و لەخشتە بردنی بەندەکانی خوای گەورە کە سەرەکی ترین و لەبەر چاو ترینیان ئەمانەن:

١) جوان کردن و ڕازاندنەوەی کردارو گوفتاری خراپ و نادروست لەبەر چاوی خەلکی:

گەر بەخێرایی سەیرێکی چوار دەوری خۆمان بکەین ئەم پیلانە ی شەیطان بە چاوانی سەرمان دەبینین ، ئەویش بەوەی کەسەرجەم ئەو شتانەی کە جوان و چاکن و خوای گەورە فەرمانی پێ کردوون لەبەر چاوی ڕەش و ناشیرینی دەکات و بوپێچەوانە شەوە هەموو ئەو شتانەی کە قەدەغە کراوە و خوای گەورە بەمایەی چونە دۆزەخی داناوە جوان وڕازاوەی دەکات و هانت دەدات کە ئەنجامی بدەیت.

ئەمڕۆ دین داری و خۆ نزیك خستنەوە لەبەرنامەی خوای گەورە کۆنەپەرستیەو بێ دینی و بێ باوەڕی نیشانەی پێش کەوتن و زانست و زانیاریە.

ئەمڕۆ گەر ووتەکانت بەبەلگەی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بێت ئەوە تۆ کۆن بیژوو دواکەوتوویت و دەبێت زۆر بەهێواشی قسە بکەیت و دەنگت هەلنەبریت نەوەکە گالتەت پێ بکەن !! بەلام گەر قسە ی کابرایەکی بێ ڕەوشت و ئارەق خۆرو درۆزن بکەیتە بەلگەی قسەکانت ئەوە دەبێت تۆماربکرێت و پاشان بکرێتە کتێب و هەزارەها نوسخەی لێ چاپ بکرێت و بەناو خەلکیدا بلاو بکرێتەوە !!

ئەمڕۆ لەبەرکردنی بەرگ و پۆشاکی ئیسلامی مانای خۆ کوشتن و ووشکی و وازهێنان لەدنیا دەگەیەنێت ، بەلام ڕووت و قوتی ئافرەتان و خۆ بەڕەلا کردن مانای زانست خوازی و بەرەو پێش چوونی ڕەوتی پێشکەوتوو خوازی دەگەیەنێت !!

بەڵێ ئەمانەو دەیان هەزار ڕوداوی تری لەم جۆرە بەڵگەی زیندوو لەبەر چاو وون لەم بارەوە ، خوای کەورەش لەم بارەوە لەسەر زمانی شەیطانەوە دەفەرموێت: ﴿قال رب بما أغويتني لأزينن لهم في الأرض ولأغوينهم أجمعين﴾ (الحجر:٣٩)

واتە: ئەی خوایە مادەم سەرت لێشێواندم پەیمان بێت شتە خراپ و بێ ناوەڕۆکەکانی دنیا لەبەرچاوی خەڵکیدا جوان بکەم و پاشان هەموویان گومڕابکەم.

٢) لەبیر چوونەوە (النسيان) : لەبیر چوونەوە یەکێکە لەو سیفەتانەی کەلەگەڵ ناخ و سروشتی مرۆڤەکاندا تێکەڵ بووەو سیفەتێکە لەخوە ناوەکیەکانی ئینسان بەلام هەروەك چۆن زۆریەی تەنە ماددی و مەعنەویەکان لایەنی چاکەو خراپەیان هەیە ئاواو بەهەمان شێوەش (لەبیر چوونەوە) لایەنی چاکەو خراپەی هەیە، لایەنی چاکەکەی لەوەدایە کە مرۆڤەکان کاتێ لەژیانی دنیادا تووشی کێشەو زیان و ناڕەحەتیەك دەبن لەو کاتەدا زۆر پێی ناڕەحەتن و خەفەتی لێ دەخۆن بەلام پاش ماوەیەك لەبیر یان دەچێتەوەو مەسەلەکە زۆر ئاسایی دەبێتەوە .

بەلام جۆری دووەمی بیر چوونەوەزۆر کارێکی خراپ و زیانێکی گەورەیە کاتێ دووچاری مرۆڤەکان دەبێت کەلەم ڕێگەیەوە شەیطان زۆر جار هەوڵی دوورخستنەوەی بەندەکان دەدات لەخوای گەورە کە ئەویش بە بیر بردنەوەی ئایەتەکانی قورئان کەلەبەرت کردووە، یان ئامۆژگاری و فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) یان بیر چوونەوەی قسەی خێرو ئامۆژگاری پیاو چاکان ، یان زۆر کەس دەبینیت کەوەك قوتابیك لەمزگەوت و شوێنەکانی تردا وانەی ڕەوشت و چاکە خوازی دەخوێنێت بەلام دەست بەجێ شەیطان بیری دەباتەوە و کارێکی وەها بەو بەندە دەکات کە هەر نەشی بیستبێ ، خوای گەورە دەربارەی ئەم باسە دەفەرموێت : ﴿ وإذا رأيت الذين يخوضون في آياتنا فأعرض عنهم حتى يخوضوا في حديث غيره وإما ينسينك الشيطان فلاتقعد بعد الذكرى مع القوم الظالمين ﴾ الأنعام:٦٨

واتە : هەر کاتێك کەسانێك بینی کەوا بەبەڵگەو نیشانەکانی ئێمە گاڵتە دەکەن ، ئەوە ڕوویان لێ وەربگێڕە و هەوڵ بدە کە ئەو باسەیان پێ بگۆڕی ، ئەگەر شەیطان لەبیری بردیتەوە کە ئەم کارە ئەنجام بدەی ئەوە بۆ جاری دووەم هەڵبستەو لایان دامەنیشە و ئەو کۆڕو کۆبوونەوەیە بەجێ بهێڵە .

بەڵێ شەیطان لەهەموو کات و شوێنێکدا هەوڵ دەدات کە کردارو گوفتارە خێرەکان لەبیر بەندەکان بباتەوە تاوەکو تووشی گوناهو تاوانیان بکات .

تەنها ڕێگە چارەش بۆ ئەم دەردوو نەخۆشیە بریتیە لەیادی پەروەردگار ئەویش بەوەی کە هەرکاتێ بەندەکان یادی خوای گەورەیان کرد ئەوە هەرگیز شەیطان ناتوانێت زەفەر بەو بەندە ببات و کاری خێری لەبیر بباتەوە .خوای گەورە لەپاداشتی ئەوکەسانەی کەیادی خوای گەورە دەکەن دەفەرموێت:

﴿ والذاكرين الله كثيرا والذاكرات اعد الله لهم مغفرة وأجرا عظيما﴾ (الأحزاب: ٣٥)

واتە ئەو پیاوو ژنانەی کە زیاد یادی پەروەردگاریان دەکەن خوای گەورە پاداشتێکی گەورە و لێ خۆشبوونی بۆ ئامادە کردوون .

٣)دروست کردنی ترس لەناخی بەندەکاندا.

بێگومان هەروەك چۆن بیرچوونەوە یەکێکە لەسیفەتەناوەکی و فیطری یەکانی ئینسان ئاواو بەهەمان شێوەش (ترس) یەکێکە لەسیفەتەفیطریەکانی ئینسان ، (محمد قطـــب) لەم بارەوەدەفەرموێت:

( إن النفس ،بطبيعتها ، لتخاف وترجوا هكذا ركب في فطرتها يولد الطفل وفيـــه هـــذان الأستعدادان متجاورين ، يخاف الظلمة ويخاف الوحدة ويخاف المناظر التى لم يألفها والأشـــخاص الذين لم يالفهم ) (منهج التربية الأسلامية /محمد قطب _ص١٢٧)

واتە: ئینسان بەسروشتی خۆی دەترسێ وبە ئومێد دەبێ ئەم حاڵەتە لەگەڵ ناخی مرۆڤەکاندا تێکەڵ بووە بەڵێ ئابەم شێوەیە دەترسێ لەتاریکی ، لەتەنیایی دەترسێ

لەسەرنەکەوتن دەترسێ لەو دیمەنانەی کەغەریبن بەلایەوە وخوی پێوەنەگرتوون ، هەروەها دەترسێ لەو کەسانەی کە خویان بەمەوە نەگرتووەو تێکەڵی لەنێوانیاندا نیە.

کەواتەئێستا زانیمان کەترسیش بەهەمان شێوە یەکێکە لەلایەنە سروشتی و فیطریەکانی ئینسان ، بەلام شەیطان لەم ڕێگەیەوە دێت و ئەم لایەنە سروشتیە خواییە دەشێوێنێ و تێکی دەدات و دەیکاتە ڕێگەیەکی سەرەکی بۆ دوورخستنەوەی بەندەکان لە ڕێگەی خواپەرستی ، ئەویش بەوەی کە ئامۆژگارییەکانی خوای گەورە و پێغەمبەریان لەبیر دەباتەوە ووەسوەسەی خراپ لەجێگاکەیدا دادەنێ ، خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرموێت :

﴿ استحوذ عليهم الشيطان فأنساهم ذكر الله ...﴾ ( المجادلة: ١٩)

واتە/ شەیطان بەسەریاندا زاڵ بووەو یادی خوای گەورەی لەبیر بردنەتەوە.

بەڵێ گومانی تێدانیە کاتی شەیطان بەسەر کەسێکدا زاڵ بوو دەست بەجێ یادی خوای گەورەی لەبیر دەباتەوە.

٤) هەست کردن بەخەفەت و دڵ تەنگی و بێ تاقەتی (قلق).

یەکێکی تر لە ورێگایانەی کەشەیطان بەکاری دەهێنێ بۆ گومڕاکردنی بەندەکان بریتی‌یە لەوەی لەناخیاندا بێ تاقەتی‌و بێ زاری و بێ ئومێدیەك دروست دەکات ئەویش بەوەی کە ئەوکەسە بەردەوام لەخەفەتدا دەژی و دڵی بەهیچ شتێ خۆش نابێت گەر گەورەترین خۆشیشی بەسەردا بێت و گەورەترین زیانیشی لەکۆڵ بوبێتەوە ، لەبەرامبەر ئەمەشدا بەردەوام دڵی تەنگەو گەرتووشی بچووکترین کێشە بێت لەناخەوە دەڕوخێ و لەخۆی دەکاتە شاخێك و کاتێکیش تاوانێك دەکات لەناخەوە بێ ئومید دەبێت و بەخۆی دەڵێ هەرگیز خوای گەورە لێم خۆش نابێت ! !

بەڕاستی گەر هیچ پیلانێکی شەیطان بۆ گومڕاکردنی بەندەکان سەری نەگرتبێ ئەوە زۆر بەدڵنیا ییەوە دەڵێین ئەم پیلانەی تەواو سەری گرتووەو نیشانەی خۆی پێکاوە ، ئەمڕۆ لەجیهان بەگشتی و وولاتی خۆمان بەتایبەتی هەزارانهەزار خەڵك تووشی دەیان نەخۆشی

دەروونی بوون هەرلە(خەم و خەفەت و بێ ئومێدبوون لە ژیانی دنیاو هەست کردن بەتاوان و دڵتەنگی و و دەیان نەخۆشی تری لەم جۆرە )

ڕاستە چەند هۆکارێکی هەیە بۆ دروست بوونی خەم و خەفەت ویێ تاقەتی لە ناو خەڵکیدا کەزۆرێکیان وەك وولاتانی ڕۆژئاوا بەهۆی هۆکاری ڕۆحی و مەعنەویەوەیەو وولاتانی ڕۆژهەڵاتیش بەهۆی هۆکاری ماددیەوە زیاتر .

بەلام لەگەڵ ئەمەشدا هیچ هۆکارو پاساوێك نیە بۆ بێ ئومێد بوون لە ژیانی دنیادا چونکە ئەوەی تۆ ئەمڕۆ بەکارێکی سەخت و خەیاڵی دەزانێ سبەینێ لەدنیای واقعدا بەچاوی خۆت دەی بینیت و دیتەدی ، بەلام شەیطان وەسوەسەی بێ ئومێدبوونی لەناخی زۆرێك لەدانیشتوانی سەر زەویدا دروست کردووە کە ئەنجامەکەی بریتیە لە خواردنەوەی ماددە سەرخۆش کەرەکان بۆ مەبەستی خۆدەربازکردن لەوکێشانەی کە مرۆڤەکان بەحسابی خۆیان لەبەرامبەریدا دەستەوسان کەوتوون و بێ ئوومێدن لەچارەسەری پاشان بەرەو ئەنجامێکی لەوە خراپ ترەبریتیە لەخۆکوشتن بەدەستی خۆت کەئەم حاڵەتە لەوولاتانی ڕۆژئاوا زۆر بلاوە بەهۆی خۆبە دوور گرتنیان لەلایەنی ڕوحی و خواپەرستی و خودانە مادیاتی ژیانی دنیا.

## تاکەچارەسەریش بۆ ئەم نەخۆشیە بریتی‌یە لە:

أ) بیرکردنەوە لەڕەحمەت و لێبوردنی بێ سنووری خوای گەورە کە چەندە لێبوردەو میهرەبانە بەرامبەر بەبەندەکانی.

ب) نەڕوخان لەبەرامبەر بەکێشەو گرفتەکان و هەوڵ دان بۆ چارەسەرکردنیان

ج) زۆر یادی خوای گەورە کردن و بێ ئاگانەبوون لێی .

د) خوێندنی قورئان بەشێوەیەکی بەردەوام و نەپچران لێی .

ه) تێکەڵی نەکردنی کەسانی خراپ و ڕەفتار شەیطان ، بەڵکو بەپێچەوانەوە تێکەڵی کردنی کەسانی چاك و خواپەرست و دین پەروەر و لەتاوان دوور .

و) نەخواردنی حەرام و خۆ بەدور گرتن لێی و هەوڵ دان بۆ بەدەست خستنی (أزكـــى طعاما) پاكژ ترین خواردن و خواردنەوە.

ئەمانەو چەند خـاڵێكی تـر چارەسـەری وەسوەسـەو قەلـەق وكەئابـەو بــێ ئومێـدی و سەرجەم نەخۆشیە نەفسیەكانە بەپشتوانی خوای گەورە (إن شاء الله) .

٥) جادووگـەری (السـحر) یـەكێكی تـر لـەو ڕێگایانـەی شـەیطان بـەكاری دەهێنــێ بـۆ گومراكردنی بەندەكان و وەلادانیان لەسەر دینی خوای گەورە بریتی‌یە لە كاری جادوو گـەری ، بەڵێ هەر لەكۆنەوە و لەسەردەمی سلیمان پێغەمبەرو موساو پێغەمبەرانی تــرداو شـەیطان هەندێ خەڵكی بەكاری جادوو گەریەوە خەریك كردووە بۆئەو مەبەستەی كە هـەروەك خـۆی لەسۆزو لێ خۆش بوونی خوای گەورە دەریان بكاتوو بەر نەفرینی خـوای گـەورەیان بخـات و لەدوارۆژیشدا بەهەتا هەتایە لەدۆزەخدا بـن، پێغەمبـەر(ﷺ) لەفەرموودەیەكدا مسـوڵمانان ئاگادار دەكاتەوە كە خۆیان لـە(٧) تـاوان بپـارێزن كـە خاوەنـەكانیان بـەهیلاكدا دەبـات كـە دەفەرموێت: (( إجتنبوا سبع الموبقات [١] ... فذكر منها السحر [٢])) .

واتە: دوور بكەونەوە لەو(٧) تاوانە بەهیلاك بەرە ، كەیەكێكیان جادووگەریە.

هەروەها لەفەرموودەیەكی تردا دەفەموێت: ((ثلاثة لايدخلون الجنة : مدمن الخمر وقـــاطع الرحم ، ومصدق بالسحر )) [٣]

واتە/ سێ كۆمەڵە ناچنە بەهەشتەوە كەبریتی بوون لە:

أ) ئەو كەسانەی كە بەردەوام سەرخۆشن.

ب) ئەو كەسانەی كەخزمەتیان بەتەواوی پچرانـدوەو بـیری لێ ناكەنـەوەو بـەدەم كێشـە نزیكەكانیانەوە ناچن.

ج) ئەو كەسانەی كەباوەڕ بەجادووگەری دەكەن و هەوڵ دەدەن كەفێری ببن.

(١) الموبقات : المهلكات (٢) رواه البخاري ومسلم وأبوداودوالنسائي

(٣) رواه الإمام أحمد في مسنده والحاكم وصححه وابن حبان وأبويعلى

٦) دروست کردنی ئاژاوەو ناخۆشی و دژایەتی لەنێوان بەندەکاندا.

قورئان گەورەترین و سەرەکی ترین کاری شەیطانی بۆ دیاری کردووین و دەفەرموێت :

﴿ إنما يريد الشيطان أن يوقع بينكم العداوة والبغضاء ﴾ (المائدة:٩١)

واتە بەتەنها کاری سەرەکی شەیطان بریتییەلەوەی دەیەوێت دژایەتی و ڕقە بەرایەتی لەنێوانتاندا دروست بکات .

بەڵێ یەکێکی تر لەکارە سەرەکی و گەورەکانی شەیطان بریتییەلە دروست کردنی ئاژاوەو فیتنە و دوویەرەکی لەنێوان بەندەکاندا بۆ مەبەستی درووست بوونی شەڕوو کوشتارو دەنگ دابڕین و ڕق لێ بوونەوە لەیەکتری .

پێغەمبەر(ﷺ) لەم بارەوە دەفەرموێ: ((إن الشيطان يضع عرشه على الماء ، ثم يبعث سراياه في الناس ، فلأقربهم عنده منزلة أعظمهم عنده فتنة ، يجيء أحدهم فيقول : مازلت بفلان حتى تركته وهو يقول كذا وكذا فيقول إبليس لاوالله ماصنعت شيئا ويجيء أحدهم فيقول : ماتركته حتى فرقت بينه وبين أهله قال فيقربه ويدنيه ويقول نعم أنت)) (رواه مسلم)

واتە شەیطان کۆشکەکەی خۆی لەسەر ئاو داناوە ، پاشان کۆمەڵ کۆمەڵ شەیطانەکانی تر دەنێرێت بۆ ناو خەڵکی، نزیکترین کەسێ لەو کۆمەڵانە لای شەیطان بریتییە لەوانەی کە گەورەترین شەڕو فتنەیان دروست کردوە لەنێوان خەڵکدا ، پاشان کەدێنەوە لای شەیطان یەکێ لەو کۆمەڵانەی کە ناردوێتی دەڵێ وام کردو وام کرد ، شەیطان لەوەڵامدا دەڵێ : سوێندبێت بەپەروەردگار هیچت نەکردووە ، پاشان یەکێکی تر لەو کۆمەڵانە دێتەوە بۆ لای و پێی دەڵێ فلانە کەسمان بەرنەدا تاوەکو جیابوونەوەمان خستە نێوان خۆی و کەس و کاریەوە ، شەیطان زۆر بەخۆش حاڵیەوە لەخۆی نزیک دەخاتەوە و پێی دەڵێ : بەڵێ بەڕاستی تۆ کاری خۆت ئەنجام داوە.

بەڵێ ئەمە کاری سەرەکی شەیطان و شوێن کەوتوەکانیانە لەکۆمەڵی ئادەمیزاد گەر سەیرێکی دنیای ئەمڕۆ و حاڵی خەڵکی بکەین ئەم کارەی شەیطان زۆر بەئاشکرا دەبینیت و

بۆمان ڕون دەبێتەوە کە شەیطان و شەیطان پەرستان چۆن لەم کارەیاندا سەرکەوتن و بەردەوام لە هەوڵ داندان بۆ سەر گرتنی ئەم کارەیان.

٧) چپە چپ (النجوی) یەکێکی‌تر لە ڕێگاکانی شەیطان بۆ گومڕاکردنی بەندەکان و دروست کردنی دڵ گرانی و ئاژاوە لەنێوانیاندا بریتی‌یە لەوەی کەکاتێ سێ کەس پێکەوە دەڕۆن دووکەسیان چپەچپ دەکەن ، کەبەڕاستی ئەمە کارێکی شەیطانیە و دروست نیە ، خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرموێت:﴿ إنما النجوى من الشيطان ليحزن الذين آمنوا وليس بضارهم شيئا إلا بإذن الله ﴾ (المجادلة:١٠)

واتە: چپە چپ بەتەنها کاری شەیکانە بۆ مەبەستی دڵ تەنگ کردنی باوەڕداران بەکاری دەهێنێ ، بەڵام ئەم کارە هیچ زیانێك ناگەیەنێت بە باوەڕداران تەنها لەکاتێکدا نەبێت کە خوای گەورە ویستی لێ بێت .

پێغەمبەریش(ﷺ) لەم بارەوە دەفەرموێت : (( إذا كنتم ثلاثة فلا يتناجي إثنان دون صاحبهما فإن ذلك يحزنه )) (رواه الشيخان)

واتە: ئەگەر سێ کەس بەیەکەوە بوون با دوانیان بەبێ ئەوی تریان چپەچپ نەکەن چونکە ئەو چپە چپە دڵی ئەوی تریان دەڕەنجێنێ) .

٨) توند ڕەوی شل ڕەوی ( الإفراط والتفريط) .

یەکێکی تر لەکارەکانی شەیطان بۆ مەبەستی گومڕاکردنی بەندەکان بریتی‌یە لەوەی کە بەندەکان یان زۆر ڕۆدەچێنێ لەمەسەلەیەکدا یان زۆر شل ئەو مەسەلەیان پێ دەگرێ ،(إبن القيم) ی جەوزی لەم بارەوە دەفەموێت :

(وما أمرالله عز وحل بأمر إلا و للشيطان فيه نزعتان ، إما تقصير وتفريط ، وإما إفراط وغلو... ) [1] واتە: کاتێ خوای گەورە فەرمان دەکات بەکارێك دەست بەجێ شەیطان دوو لایەن لەو کەسەدا دروست دەکات ، یان ئەوەتە لایەنی کەم تەرخەمی و شل گیریە ، وەیان لایەنی زۆر ڕۆچوون و توندیە.

(١) الوابل الصيب /إبن القيم الجوزی _ ص١٩

بەڕاستی توندو شل گرتنی دین یەکێکە لەو خاڵە سەرەکیانە ی کە گەلەکانی پێش ئیسلامیان لەناو برد و بەر ڕقی پەروەردگاری خستن ، پاشان لەم سەردەمەی خۆشماندا زۆرێك لە مسوڵمانان دەبینیت کەوا هەندێکیان ئەوەندە دینیان بەشلی و هێواشی گرتووە کە بەسادەترین ڕوداو و کێشە دادەنێن و لەدەستی دەدەن وەهەندێکی تریشیان توند ئاینیان گرتوە تاوەکو سەرەنجام هەندێ لەشتە حەڵاڵەکانیان لەخۆیان حەرام کردوەو هەرگیز بزە لەسەر لێویان دروست نابێت. هەرلەم ڕێگەوە شەیطان دەچێتە دڵی ئەو کەسانەوەو پێیان دەڵێ : گەر یەکێکتان بینی کەوا لەکاتی دەست نوێژدا سێ جار دەم و چاوی شت تۆ بیکە بەهەشت جارو زیاترەوە بە پێچەوانەوە فەرمانەکانیخوای گەورەت وا لا ئاسان و سوك دەکات کە ئەگەر نەشی کەیت زۆر ئاسایی بێت بەلاتەوەو پاشان تاوانت زۆر بەلاوە سوك و ئاسان دەکات و خێرکردن و ماڵ بەخشینیش زۆر لەلا قورس و گران دەکات کەکەس سودت لێ نەبینێ.

٩) یەکێکی تر لەفێڵ و ڕێگاکانی شەیطان بۆ گومراکردنی بەندەکان بریتی‌یە لەوەی لەو دەرگایەوە دێتە ژوورەوە بۆ بەندەکان کە ئارەزویان تێدا دەجوڵێ و زۆر حەزی پێ دەکەن (إبن القیم) لەم بارەوە دەفەرموێت :

(إن الشيطان يجري من ابن آدم مجرى الدم حتى يصادف نفسه ويخالطه ، ويسألها عمـا تحبـه وتؤثره فإذا عرفه استعان بها على العبد ودخل عليه من هذا الباب .....) [1]

واتە: شەیطان هەروەك خوێن بەناو لەشی مرۆڤدا دەگەڕێ تا ئەو پلەیەی کە بەتەواوی تێکەڵ بەدەروونی مرۆڤەکان دەبێت ، پاشان پرسیارو وەسوەسە لەدڵی ئەوکەسە دروست دەکات کە حەزی لێیەتی و خۆش حاڵە پێی و کاری تێ دەکات ، کاتێ شەیطان ئەمەی زانی ئەوە لەو دەرگایەوە خۆی دەکات بەژووردا.

بەڵێ کەسی وەها هەیە کە حەزی لەپارەیە هەر بۆیە شەیطان لەدەرگای خۆشەویستی پارەو ماڵی دنیاوە دەچێتە ژوورەوە بۆ ئەو بەندەیە و هەموو هۆشوو بیری دەکاتە پارەو

(١) إغاثة اللهفان ، ج١ ص١٣٢

کۆکردنەوەی گەورەترین سەرمایە.

هەروەها کەسی وامەیە زۆر حەزی بەلایەنی ئافرەت و تێ کەڵی و قسەکردن دەکات پاشان شەیطان لەم دەرگایەوە بۆی دەچێتە ژوورەوەو هەموو بیر کردنەوەی ئەو کەسە دەکاتەبیر کردنەوە لە جوانی و لاشە ورێیشتن و قسەکردن و بزەی ئافرەتان تا کار دەگاتە ئەو ئەنجامەی کەسەر لەزیناو داوێن پیسیەوە دەردەکات (خوا پەنامان بدات)

وەهەروەها بۆ سەرجەم لایەنەکانی تریش بەهەمان شێوەیە .

گەر لەو ڕوانگەیەوە سەیرێکی قورئان بکەین ئەوە دەبینین کەوا شەیطان چۆن لەو دەرگایەوە چووە ژوورەوە بۆ ئادەم و حەوا لەبەهەشتدا کە حەزیان لێ دەکردو خۆش حاڵ بوون پێی وپێی ووتن: ﴿ مانهاكما ربكما عن هذه الشجرة إلا أن تكونا ملكين أو تكونا من الخالدين ﴾ (الأعراف: ٢٠)

## بەندی شەشەم
## تایبەت مەندیەکانی شەیطان

وەك ئاشکرایە هەموو جۆرە دروست کراوێکی خوای گەورە تایبەت مەندێکی تایبەتی خۆی هەیە کە پێی بەناوبانگە و دەناسرێتەوە پێی ، بەڵێ هەر لەم ڕوانگەیەوە گەر بچینە خزمەت قورئان و سوننەت ئەوە لەتایبەت مەندێتی شەیطان تێ دەگەین کە بەرچاو ترینیان ئەمانەن.

١) شەیطان دروست کراوێکی بێ باوەڕە بەرامبەر پەروەردگاری (کفور لربە) گەر سەرنجی ژیانی شەیطان بدەین ئەو ڕاستیە مان بۆ دەردەکەوێت کەتەمەنی درێژوو خراپی لە بێ باوەڕی و سەرکەشی پەروەردگاریدا سەرف کردوە ، پاشان گەر لەمە زیاتر بکۆڵینەوە لەم لایەنە ئەوەتێ دەگەین کەشەیطان لەسەرەتاوە لەسەر بناغەی بێ باوەڕی بوو کەنەفرینی لێ‌کراو لەبەهەشت دەرکرایە دەرەوە و بوو بەگەورەترین دووژمنی خوای گەورە بەڵێ‌خوای گەورە باسی ئەم سیفەتە پیسەی شەیطانمان بۆ دەکات و دەفەرموێت :

﴿ وكان الشيطان لربه كفورا﴾ (الإسراء:٢٧)

واتە: شەیطان لەبەرامبەر پەروەردگاریدا بێ باوەڕ بوو .

زۆر کەس کاتێ دەگات بەخزمەتی ئەم ئایەتە واتێ دەگات کە شەیطان باوەڕی بەپەروەردگاری نیەو دەڵێت خوانیە؟ بەڵام لەڕاستیدا ئەم تێ گەیشتنە زۆر هەڵەیە چونکە شەیطان لەهەموومان زیاتر خوای گەورە دەناسێ و باوەڕی پێی هەیە و زۆر جاریش سوێندی پێ دەخوات !! دەی کەوا بێ شەیطان بۆ بێ باوەڕە بەرامبەر پەروەردگاری؟!

لەوڵامدا دەڵێین : کاری بێ باوەڕی تەنها لەباوەڕ نەبوون بەخوای گەورەدا خۆی نابینێتەوە چونکە گەر وا بوایە ئەوە شەیطان بە بێ باوەڕ ناوی دەرنەدەکرد ، یان عەرەبە بت پەرستەکانی سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) بەهەمان شێوە ، بەڵام کاتێ سەیری ئایەتەکانی خواو فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دەکەیت دەگەیتە سەو ئەنجامەی کە وانیە بەڵکو باوەڕ نەبوون بەخوای گەورە یەکێکە لەو خاڵانەی کەمرۆڤەکان بەرەو بێ باوەڕی دەبات بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هەرکەسێك بێ فەرمانی خوای گەورەی کردو بە بەرنامەی خوا کاری نەکردوبڕی بەرنامەی خوای گەورە وەستاو گاڵتەی بەئایەت و بەڵگەکانی خوای گەورە کردو دژی پێغەمبەران و باوەڕداران وەستا ئەوە پێی بێ باوەڕ دەبێت و لەدینی خوای گەورە پێی دەچێتە دەرەوە.

هەر لەبەر ئەم خاڵەی کە بێ باوەڕی ( کفر ) خاڵێکی هاوبەشە لەنێوان شەیطان و مرۆڤەکاندا هەروەك قورئان دەفەرموێت: ﴿ وكان الشيطان لربه كفورا ﴾ واتە: شەیطان بێ باوەڕ بوو بەرامبەر بە پەروەردگاری.

هەروەها دەربارەی مرۆڤەکان دەفەرموێت: ﴿ وكان الإنسان كفورا ﴾ الاسراء:٦٧

واتە: ئینسان بەهەمیشەیی ناسوپاس و بێ باوەڕ بووە.

٢) دووەم سیفەتی شەیطان بریتیە لە دروست کردنی وەسوەسەو دڵە ڕاوکێ لە ناخی بەندەکاندا ، پێغەمبەر (ﷺ) لەم بارەوە دەفەرموێت : ((يأتي الشيطان أحدكم فيقول من خلق كذا ؟ من خلق كذا ؟ حتى يقول من خلق ربك ؟ فإذا بلغه فليستعذ بالله والينتــه)) ( رواه البخاری ومسلم ) .. واتە: شەیطان دێت بۆ لای یەکێکتان و پێتان دەڵێ : ئەوەکێ دروستی کردووە

؟ هەتا دەڵێ ئەی پەروەردگارت کێ دروستی کردوە ؟ هەرکاتێ ئەم پرسیارەتان بۆ دروست بوو ئەوە پەنا بگرن بەخوای گەورەو بوەستن و لەوە زیاتر بیر مەکەنەوە .

یان لەفەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: ((الشیطان جاثم علی قلب ابن آدم فإذا ذكــر الله خنس وإذا غفــل وســوس )) (رواه البخاری ) ..واتە: شەیطان خۆی داکوتاوە بەسەر دڵی نەوەکانی ئادەمدا ، هەرکاتێ ئەویەندانە یادی خوای گەورەیان کرد ئەوە شەیطان خۆی بچوك و گرژ دەکاتــەوە ، بــەڵام هــەرکاتێ ئــەو بەندەیــە غــافل و بــێ ئاگــابوو لــەیادی پەروەردگاری ، ئەوە شەیطان تووشی وەسوەسەو دڵە ڕاوکێی دەکات.

بەڵێ هەر ئەم سیفەتەی شەیطان بوو کە بووە هۆی دەرکردنی ئادەم و حەوا لە بەهەشت و خواردنی بەری ئەو دارەی کە لێیان قەدەغە کرابوو ، قورئان دەفەرموێت:

﴿ فوسوس لهما الشيطان ليبدي لهما ماوري عنهما من سوءاتهما وقال مانهاكما ربكما عــن هذه الشجرة إلا أن تكون ملكين أو تكونا من الخالدين ؟وقاسمهما إني لكما مــن النــاصحين﴾ (الأعراف:٢٠-٢١) .

واتە: شەیطان وەسوەسەی بۆ ئادەم و حەوا دروست کرد بۆ مەبەستی ئەوەیعــورەتی داپۆشراویان بۆ یەکتری دەربخاو بەڕوتی و بێ بەرگی یەکتری ببیننو پاشان پــێی ووتن: ئەوەبۆچی پەروەردگارتان بەری ئەو درەختەی لێ حەرام کردوون وادیارە نایەوێت ئێوە ببنە دووفریشتە لە بەهەشتدا و بەنەمری بمێننەوە ، وەسوێندیشی بۆ خواردن کە مــن کاتــێ ئــەم قسانەتان بۆ دەکەم تەنها بەرژەوەندی ئێوەم دەوێت.

چارەسەری ئەم وەسوەسەیەش تەنها بریتی‌یــە لــەیادی خــوای گــەورەو پــەناگرتن پــێی هەروەك خوای گەورە فێرمان دەکات و پێمان دەفەرموێت : ﴿قل أعوذ برب الناس ، ملــك الناس ، إله الناس ، من شر الوسواس الخناس ، الذی يوسوس فی صدور الناس ، مـــن الجنــة والناس ﴾ (النــاس: ١-٦)...واتــە: بڵــێ پــەنا ئــەگرم بەپــەروەدگاری خــەڵکی ، فــەرمان ڕەوای خــەڵکی ، پەرستراوی خــەڵکی ، لــەزیانی وەسوەپەیداکەری خۆ پەنهانکــەر ، ئــەوەی کــە وەسوەسە دروست دەکات لەدڵی مرۆڤەکاندا ، لەجنۆکەو ئادەمیزاد.

٣)یەکێکی تر لەسیفەت و تایبەتمەندیەکانی شەیطان ئەوەیە کە ئەو ئێمە دەبینێ‌و ئیمە ئەو نابینین هەروەك دەفەرموێت:﴿ إنه يراكم هو قبيله من حيث لاترونهم ﴾ (الاعراف :٢٧).. واتە: شەیطان و هاودەستەکانی ئێوە دەبینن لەکاتێکدا ئێوە ئەوان نابینن.

بەڵێ ئەم سیفەتەش یەکێکە لەو تایبەتمەنیانەی کە بە شەیطان دراوەو مرۆڤەکان دەبینن و توانای سەیر کردن و بینینیان لەئێمە زۆر بەهێزترە.

٤) یەکێ تر لەتایبەتمەنیەکانی شەیطان ئەوەیە کە دوژمنی سەر سەخت و ئاشکرای مرۆڤەکانە بەگشتی، سەرەتای ئەم دوژمنایەتیەش لەوەوە دەستی پێ کردوو سەری هەڵدا کەشەیطان فەرمانی پەروەردگاری شکاندوو کڕنووشی نەبرد بۆ ئادەم، ئا لەو کاتەوە شەیطان بوو بە گەورەتین و ئاشکرا ترین دوژمنی مرۆڤەکان و بڕیاری داو سوێندی بەدەسەلاتی خوای گەورە خوارد کە﴿ لأغوينهم أجمعين ﴾ پەیمان بێت هەموویان لەڕێگەڕاستەکەی تۆ دەربکەم و لەدوارۆژیشدا بەرەو دۆزەخ بچن.

خوای گەورە دەربارەی ئەم سیفەت و تایبەت مەندیەی شەیطان دەفەرموێت ﴿ولا تتبعوا خطرات الشيطان إنه لكم عدو مبين ﴾ (البقرة:١٦٨ ) ... واتە: ئەی مرۆڤەکان شوێن ڕێگاو کارەکانی شەیگان مەکەون چونکە شەیگان دوژمنی سەرسەخت و ئاشکرای ئێوەیە.

یان دەفەرموێت : ﴿ إن الشيطان لكم عدو فاتخذوه عدوا ﴾ (فاطر :٦)

واتە: شەیطان دوژمنی ئێوەیە ، دەی ئێوەش بیکەن بەدوژمنی خۆتان .

بەڕاستی ئینسان کاتێ لەم ئایەت و ئامۆژگاریانەی خوای گەورە بیردەکاتەوە دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە دوژمنی سەرەکی و ڕوون و بەرچاوی بریتیە لەشەیطان و ئەو ڕێگایانەی کەشەیطان بەکاری دەهێنی بۆ گومراکردنی بەندەکان . بەڵێ گومانی تێدانیە کاتێ مرۆڤەکان لەدنیادا گەر دوژمنیان هەبێت ئەوە حسابی بۆ دەکەن و خۆیانی بۆ ئامادە دەکەن و بەردەوام لەسەنگەری دژایەتی ڕووبەڕوو بونەوەدان لە بەرامبەریدا بۆ مەبەستی ئەوەی لەکاتی بێ ئاگاییدا زەفەری پێ نەبرێ لەلایەن دوژمنەکەیەوە.

بەلام زۆر بەداخەوە ئەمڕۆ مرۆڤەکان بەگشتی دوژمنی سەرەکی خۆیان لەبیر چۆتـەوە و خۆیان خەریك کـردوە بەدوژمنایەتی کردنـی یـەکترەوە و شـەیطان و دۆستەکانیان کردۆتـە هاوەڵ و خۆشەویستی خۆیان ! ! تاسـەرئەنجام کاریـەوە گەیشتووە کـە کـەم شوێن مـابێت لەسەر زەوی‌دا شەڕی تێدا نەبێت و مرۆڤەکان دەستیان سـوور نـەبووبێت لـەخوێنی براکـەی تریدا.

## بەندی حەوتەم
## ئامۆژگاری خوای گەورە بۆ بەندەکان لەبارەی شەیطانەوە

بێگومان خوای گەورە هەروا مرۆڤەکانی بەبێ هودە بەر بەرنەداوە کەلە دنیادا بخـۆن و بحەوێنەوە و پـارە پـەیدا بکـەن و بژیـن بـەڵکو لەگـەڵ ئـەوەی کـە هـەزاران نیعمـەتی بەخەلات بەخشیوە بـە سـەرجەم مرۆڤـەکان ئـاواش نیعمـەتێکی تـری پێداوون کە بریتی‌یە لەئاگادار کردنەوە و ئامۆژگاری کردنیان دەربارەی شەیطان، کە گرنگترین و بـەر چـاو تریـن ئامۆژگاری خوای گەورە بریتی‌یە لەم چەند خاڵە:

١)شـوێن نەکـەوتنی شـەیطان : خـوای گـەورە ئاگاداری‌نـەوەکانی ئـادەم دەکـات و دەفەرموێت:

﴿ ومن يتخذ الشيطان وليا من دون الله فقد خسر خسرانا مبينا﴾ (النساء:١١٩)

واتـە: هەکەسێ شـەیطان بکاتـە خۆشەویسـت و پاڵپشـتی خـۆی و پشـت بکاتـە خـوای گەورە ئەوە دووچاری زەرەر مەندیەکی ڕون وئاشکرا دەبێت.

شـوێن کـەوتنی شـەیطان ئـەوە ناگەیـەنێ کـەوەك کـاری سـەربازی بچیـت نـاوی خـۆت بنوسیت و جەنگ بکەیت لەپێناوی شەیطاندا بـەڵکو شـوێن کـەوتنی شـەیطان بـەوە دەبێـت کـەتاوان بکـەیت و بـێ فـەرمانی خـوای گـەورە بکـەیت ، هـەروەك گوتراویشـە هـەموو بـێ فەرمانیەکی خوای گەورە شوێن کەوتنێکی شەیطانە.

٢)شەیطان نەپەرستین،

یەکێکی تر لەئامۆژگاری یەکانی خوای گەورە بریتی‌یە لەوەی کە ئاگادار مـان دەکاتـەوە کەشەیطان نەپەرستین و گوێ رایەڵی نەکەین.

ئەو کەسانەی کەشـەیطان دەپەرسـتن زۆر بـەتوندی بەرپـەچی ئـەم ئامۆژگاریـە خوایـیـە دەدەنەوەو دەڵێین: ئێمە شەیطانمان نەپەرسـتووەونوێژمان بـۆ نـەکردووە و کڕنوشمـان بـۆ نەبردووە ؟!

لەوەڵامدا دەڵێین : ئەو کەسـانەی وا دەڵێـن زۆر بەهەڵـەدا چـوون و لـەواتای پـەرسـتن و بەندایەتی حاڵی نەبوون چونکە مەرج نیە پەرستن تەنها بریتی بێت لەکڕنوش بـۆ بـردن یـان ئەنجام دانی نوێژو ڕۆژو ، بەڵکو مانای پەرستن (عبـــادة) بـەو واتایـە دێـت کـە هەرکەسـێ حەڵاڵی بۆ حەرام کردیت و حەرامی بۆ حەڵاڵ کردیت و تـۆش گـوێ رایـەڵی بوویـت ئـەوە تـۆ بوویتە بەندەی ئەو کەس و بەرنامەیەو کارە کەشت بوەتە پەرستن بـۆی هـەروەك جارێکیـان پێغەمبەر(ﷺ) ئایەتی ﴿ اتخذوا أحبارهم ورهبانهم أربابا مـــن دون الله ﴾ ی دەخوێنـد لـەم کاتەدا (عدی کوڕی حاتم) کەکابرایەکی تازە مسوڵمان بووی کۆنەمەسیحی بوو گـوێ بیسـتی ئەم ئایەتە بوو هاتـە خزمـەت پێغەمبـەرو پـێی ووت : ئـەی پێغەمبـەری خـوا ئێمـە وەختـی خۆی لەسەردەمی پێش مسوڵمانێتیماندازاناکانی خۆمان نەدەپەرست ! !

پێغەمبەریش (ﷺ) لەوەڵامدا پـێی فـەرموو : ئایـا حـەڵاڵیان بـۆ حـەرام نـەدەکردن ؟ و حەرامیان بۆ حەڵاڵ نەدەکردن ؟!

(عدی کوری حاتم)لەوەڵامدا فەرمووی (بەڵێ) پێغەمبەریش ( ﷺ ) پێی فەرموو: ( تلـك عبوديتهم إياهم ).. واتە: مادەم حەڵاڵیان بۆ حەرام دەکردن و حەرامیان بۆ حـەڵاڵ دەکـردن و ئێوەش شوێنیان دەکەوتن ورازی دەبـوون بەقسـە و فەرمانـەکانان کەواتەئەمـە پەرسـتنی ئێوە بووە بۆ ئەوان ، خوای گەورەش لەم بارەوە دەفەرموێت :﴿ ألم أعهد إليكم يـــابني آدم ألا تعبدوا الشيطان إنه لكم عدو مبين وأن اعبدوني هذا صراط مستقيم ﴾ (سورة يـــس:٥٩ –٦٠)

واتە: ئەی نەوەکانی ئادەم ئایا ئێوە پەیمانتان لێ وەرنەگیرا بەوەی کە شەیطان نەپەرستن ، چونکە شەیطان دوژمنی ئاشکرای ئێوەیە ؟ وەمن بپەرستن ئەمەرێگای ڕاستە.

٣) سێ هەمین ئامۆژگاری خوای گەورە بۆ بەندەکان دەربارەی شەیطان بریتییە لەوەی کەشوێن ڕێگاو کارەکانی نەکەو ن هەروەك دەفەرموێت : ﴿ ولاتتبعوا خطوات الشيطان إنه لكم عدو مبين ﴾ (البقرة: ١٦٨) .. واتە: شوێن ڕێگاو و شوێنەوارو کردارەکانی شەیطان مەکەون چونکە شەیطان دوژمنێکی سەرسەخت و ئاشکرای ئێوەیە.

ڕێگاو شوێنەوارو کردارەکانی شەیطان زۆرن هەروەك لەبەندی پێنجەم دا باسمان لێوەکرد و خوای گەورەش ئاگادارمان دەکاتەوە کەشوین ئەو ڕێگایانە نەکەوین کەڕێگای شەیطانە بۆ مەبەستی ئەوەی چارەنووسمان وەك چارەنووسی شەیطانی لێ بەسەرنەیەتوو بە دۆزەخ شاد نەبین.

٤)ئامۆژگاریەکی تر لە ئامۆژگاریەکانی خوای گەورە بۆمرۆڤەکان بریتییە لەوەی کە خوای گەورە ئاگادار مان دەکاتەوە بەوەی کە وریای خۆمان بین و شەیطان گومڕاو فێڵمان لێ نەکات هەروەك دەفەرموێت ﴿ يابني آدم لايفتننكم الشيطان كما أخرج أبويكم من الجنة ﴾ (الأعراف:٢٧)...واتە: ئەی نەوەکانی ئادەم شەیطان گومڕا و فێڵتان لێنەکات هەوەك چۆن فێڵی لە(ئادەم و حەوا) کردوو دەری کردن لەبەهەشت بەهۆی خواردنی بەری ئەو درەختەی لێیان حەرام کرابوو.

لەدنیای خۆماندا ئەو کەسانەی کەتەمەنیان درێژە لەفێڵ بازی و چاو بەست کردنی خەڵکی دا کارزان تروو کارامەترن لەو کەسانەی کە ماوەیەکی کەمە دەستیان داوەتە ئەوکارە گەر هەر لەم ڕوانگەیەوە سەرنج بدەین لەشەیطان کەلەپێش ئینسانەوە هەبووە دەبێت تائێستا چەند (ملیارو تلیار) فێڵ و تەڵەکەو کاری ساختەکاری بزانێ و لەهەرکات و سەردەمێکا بەشێوەو شێوازی جیاجیا بەکاریان بهێنێ بۆ گو مڕاکردنی بەندەکان؟

لەوەلامدای دەڵێین: فێڵو تەڵەکە بازیەکانی شەیطان لەژمارە نایەت و گەر خوای گەورە بەرەحم و سۆزی خۆی بەرامبەرمان ئاگاداری نەکردینایەوە لەتەڵەکەو فێڵەکانی شەیطان ئەوە زۆر بەدەگمەن لەداوی ڕزگارمان دەبو و دەچوینە بەهەشتەوە.

٥)پێنجەم ئامۆژگاری خوای گەورە بۆ بەندەکانی دەربارەی شەیطان ، بریتی‌یە لەوەی کە فەرمانمان پی دەکات بەوەی کە پەنا بگرین لەشەیطانی نەفرین لیٚ کراو لەهەموو کاتێکدا هەروەك ئەم نمونانەی لای خوارەوە:

( أ ) لەکاتی قورئان خوێندندا وەك دەفەرموێت: ﴿ فإذا قرأت القرآن فاستعذ بالله من الشيطان الرجيم ﴾.. واتە: کاتیٚ قورئانت خوێند پەنابگرە بەپەروەردگارت لە شەیطانی نەفرین لیٚکراو.

ب)لەکاتی توڕەبووندا پەنابگرە بەخوای گەورە لەشەیطانی نەفرین لیٚکراو هەروەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:

(( إني لأعلم كلمة لو قالها لذهب عنه ما يجد من الغضب)) فقالوا : ماهي يارسول الله ؟! قال يقول ( اللهم إني أعوذ بك من الشيطان الرجيم ) (رواه البخارى ومسلم وأبو داود وأحمد )

واتە: من (محمد) ووشەیەك دەزانم گەر هەرکەسیٚ بیلیٚ ئەوە توڕەبیەکەی دەڕوات و دەرەوێتەوە ، ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا چی‌یە ئەو ووشەیە ؟! لەوەلامدا فەرمووی بلێن (ئەی پەروەردگارم من پەنا دەگرم بەتۆ لە شەیطانی نەفرین لیٚکراو.

ج) لەکاتی جووت بوون لەگەڵ خێزانی حەلاڵی خۆتدا : هەروەك دەفەرموێت : ((بسم الله ، اللهم جنبنا الشيطان ، وجنب الشيطان مارزقتنـــا)) (متفق عليه).. واتـە: بـەناوی خـوا ، ئـەی پەروەدگارم لەشەیطانمان دوریخەرەوە ، هەروەها ئەو ڕۆزیـەی کـەدەشمان دەیتـیٚ _ کاتـیٚ کە منداڵە_ لەشەیطانی دور بخەرەوە.

د) لەکاتی بیستنی دەنگی گویٚ درێژ : پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت : (( إذا نهق الحمـــــار فتعوذوا بالله من الشيطان الرجيم ))[1] واتە: کاتیٚ گوێتان لەدەنگی گویٚ درێژ بـوو پـەنابگرن بەخوای گەورە لەشەیطانی نەفرین لیٚکراو ، چونکە لەشەودا شەیطان دەبینـیٚ ) وەباشـترین شتیٚ کەخەڵکی پەنای پیٚ بگرن بریتی‌یە لە هەردوو سورەتـی (الناس )و( الفلق) [2] (قل أعــوذ برب الناس ) ( قل أعوذ برب الفلق) •

---

(١) رواه الطبراني في معجمه الكبير بإسناد صحيح (صحيح الجامع)  (٢) رواه النسائي

٦)شەشەم ئامۆژگاری بۆبەندەکانی بریتی‌یە لەوەی کەفەرمانیان پێدەکات کەقسەی جوان بکەن ووتەی خێرو چاك بەزمانیان بکەن هەروەك دەفەرموێت: ﴿وقل لعبادی یقولوا التي هي أحسن إن الشيطان ينزغ بينهم إن الشيطان كان للأنسان عدوا مبينا﴾(الإسراء: ٥٣)

واته : ئەی محمد بلّێ بەبەندەکانم کەجوانترین و چاکترین قسە بکەن چونکە شەیطان لەبەرامبەر مرۆڤەکاندا دوژمنێکی سەرسەخت و دیارە.

بەڕاستی قسەکردن کارێکی زۆر ئاسانەو ئەوەی زمانی لەدەمدابێت ولاڵنەبێت دەتوانێت قسەبکات ! بەلام ئایا هەموو قسەکردنێك (قول أحسن)ە؟ واتە: باشترین قسەیە؟ نەخێر قسەکردن چەندە ئاسانە ووتنی خێرو قسەی جوان ئەوەندە گرانەو کەسێ زۆر باوەڕ دارو لەخواترس نەبێت هەرگیز ناتوانێت زمانی وەك ئەندامێکی لەشی بە باشی بەکاربهێنێ ، هەر لەبەر ئەمەیە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت :

((من كان يومن بالله واليوم الآخر فليقل خيرا أوليصمت )) (متفق عليه)

واتە: هەرکەسێ باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایی هەیەیباخێر بلّێ یان گەر ( قسەی خێر نازانێ) بلّێ با بێ دەنگ بێت

چونکە بەڕاستی بەهۆی زمان پیسیەوە یە کە زۆریەی زۆری خێرو کردەوە جوانەکانت دەسرێتەوەو لەڕۆژی دواییدا دەبێتە یەکێ لەو کەسانەی کە بە(مفلس) واتە (هیچ پێ نەبوو) بەناویانگن .

هەریەهۆی بەکارهێنانی زمانی خراپەوەیە کە فیتنەو قسەهێنان و دووزمانی و ئاژاوە دروست دەبێت و هەزاران کەسی تێدا دەکوژرێت.

٧) یەکێکی تر لە ئامۆژگاریەکانی خوای گەورە ، بریتی‌یە لەوەی کەفەرمانمان پێ دەکات بەگوێڕایەڵی کردنی خۆی و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) هەروەك دەفەرموێت ﴿ يا أيها الذين آمنوا اطيعوا الله وأطيعوا الرسول ﴾ واتە: ئەی باوەڕداران گوێ ڕایەڵی خوای گەورە و پێغەمبەرەکەیبکەن.

بەڕاستی گەورەترین تەوریك بۆ سەری شەیطان و شوێن کەوتوانی بریتی‌یە لە گوێڕایەڵی کردنی خوای گەورەوپێغەمبەرەکەی ، چونکە شەیطان لەسەر بنچینەی گوێڕایەڵی نەکردنی خوای گەورە و دەرچون لەفەرمانی بەر نەفرینی پەروەردگاری کەوت و بوبە هاوڕێی ئاگری دۆزەخ و توندترین سزای بۆ خۆی بەدەست هێنا.

گومانیشی تێدا نیە زۆربەی زۆری یاساکانی خوای گەورە گشتین و(عام) و حوکمە بۆ هەموو ئەو کەسانەی کەلە ژێر ئەو یاسایەدا جێگەیان دەبێتەوە.

بەپێی ئەم یاسای سەرەوە هەرکەسێك لەفەرمانی پەروەردگاری دەرچێ‌و بەگوێی پێغەمبەرەکەی نەکات ئەوە هەمان حوکمی شەیطانی هەیە . چونکە بەهەمان رێگەی ئەودا دەڕوات و بەردەوامە لەسەر کاری سەرپێچی و لادانی خۆی.

پاشان خوای گەورە تەنها بەوەندە ڕازی نیە کە تەنها گوێ ڕایەڵی خۆی بکەین بەڵکو لەگەڵ ئەوەشدا فەرمانمان پێ دەکات بەرامبەر بەگوێ ڕایەڵی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کەئەمەش گەورەترین بەڵگەیە لەسەر پاکی و بێ تاوانی پێغەمبەر، کە هەروەك ئیمامی (فخرالدین) ی رازی لەتەفسیر (الکبیر) داباسی لێوە کردووە.

## بەندی هەشتەم
## دوا ووتەو دوا ئامۆژگاری

### لەکۆتا بەندی ئەم چیرۆکەدا دەڵێین :

هەموو باخچەیەکی بەرهەم دار سود بەخشە بە تایبەتی بۆ ئەو ڕێبوارانەی کە پێیدا تێ دەپەڕن و گەشتی پیادا دەکەن ، بەڵێ هەندێ ڕێبواری دووربین وژیر هەیە کەبیری ئەو ڕێگا دوورەی بەردەمی خۆی دەکات و دەزانێت کەوا پێویستی بە توێشووی زۆر هەیە بۆ برسێتی و نارەحەتیەکانی ڕێگا هەر لەبەر ئەمەیە کە هەوڵی ئەوە دەدات کەتوێشوو بەرهەمی زۆر لەگەڵ خۆی ببات ، لەگەڵ ئەمەشدا ڕێبواری وەهاهەیە کەبیری تەسکەو بیر لەبەردەم و

داهاتووی خۆی ناکاتەوە تەنها بیر لەو کاتە دەکاتەوە کەتێیدا دەژی هەربۆیـە ئـەوەی لـەناو ئەو باخەدا خواردی و نۆشی کرد تەنها هەرئەوەندەیەو مەخابن بێ ئاگایـە ، کـەوا بیابـانێکی دوورو درێژو بێ ئاوو گەرمی لەبەردەم دایەویە دڵنیاییش پێ دەگات .

بەڵێ ئێمەش بەباخچەی پڕ بەرهەم و بۆن خۆشی (ئادەم) پێغەمبەردا ( علیه السـلام) گەشتمان کردوو شارەزا بووین لەم باس و بەسەرهاتەدا.

پاش ئەمە هەرکەسێك پەندو ئامۆژگاری لـەم چیرۆکـەدا وەرگـرت و توێشـووی ئامۆژگاری بۆ کاروانی ڕێگەی ژیانی چنیـەوەو کۆڵـی پشـتی لێ پـڕ کـرد ئـەوە بەدڵنیاییـەوە لەڕێگـەدا فریای دەکەوێت و پێی دەگاتە ئەو مەنزڵەی کە خۆی مەبەستیەتی.

بەڵام بەپێچەوانەشەوە هەر کەسێك هەروا بەشێوەیەکی سادەو ساکار بڕوانێتـە چـیرۆکی پێغەمبەران سوودوو پەندو ئامۆژگاری لێ وەرنەگرێ ئەوە وێنەی ئەو کەسە وەك کاروانچیـەك وەهایە کەبدات بەلای باخێکی پڕ بەرهەمدا و تەنها ئەوەندە بخوات کەبەسـی بێـت و حسـاب بۆ ئەو ڕێگە دوورو درێژە نەکات کە لە بەردەمیدایە.

بەڵام دەبێت لەوەش ئاگـادار و دڵنیـا بـین کـەوا بـاخ چـەندە جـوان و دڵ ڕفێـن بەرهـەم داربێت ئەوە بەبێ درك و ڕوەکی بێ سوود نابێت.

بەهەمان شێوەش ژیانی سەرجەم پێغەمبەران (علیهم السلام) بریتـیـە لەو باخـە فێنـك و بەبەرهەم دڵ ڕفێنە ی کە هۆکاری سەرەکین بۆ شفای دڵە نەخۆشەکان ، هەروەها شـەیطان و شوێن کەوتوانیشی بریتـین لـەو درك و بـەردو ڕوەکـە بـێ سـوودانەی کـە زۆر جـار ئـازاری گەشتیاران دەدەن و شێوە و دیمەنی باخەکەیان ناشیرین کردووە.

ئالەم کاتەدا پێویستە لەسەرمان کەوا قۆڵی مەردایەتی و بـاوەڕی لێ هـەڵ بکـەین و ئـەو درك و بەردو ڕوەکـە بـێ سـوودانە لـەڕەگ و ڕیشـەوە هەڵبکـەنین و شـوێنەواریان نـەهێڵین ، بەهەمان شـێوە لـەدنیای واقعیشدا واجبـە لەسـەرمان کـەڕەگ و ڕیشـاڵی شـەیطان و شـوێن کـەوتوانیان بـبڕین و پیلانـەکانیان پوچـەڵ بکەینـەوە بـۆ مەبەسـتی جـوان کردنـی دیمـەنی باخچەی ژیان و خۆش گوزەرانی خەڵکی.

# دوا ئامۆژگاری

١) دروست بوونی ئادەم لەخۆڵ تێمان دەگەیەنێت کەسەرجەم مرۆڤەکان لەیەك ئاست دان و کەسیان لەوی تریان زۆر تر نیە تەنها بە لە خواترسان نەبێت ( إن أكرمكم عند الله أتقاكم) .

٢) درووست بوونی ئێمەو سەرجەم مرۆڤایەتی لەئادەم ئەو ڕاستیە زانستیەمان تێ دەگەیەنێت کە مرۆڤەکان لەمرۆڤن نەك لەمەیمون و ئاژەڵ هەروەك هەندێ کەسی ئاژەڵ ڕەفتار چەند ساڵێك بانگەشەیان بۆ کرد .

٣) دروست بوونی فریشتەو پەری ( الجن والملائكه)ئەو ڕاستیەمان تێ دەگەیەنێت کە بەواقعی بەمرۆڤەکان دەڵێ:

ئەی مرۆڤ وا هەست نەکەیت تەنها تۆ هەیت لەدنیای ماددیدا بەڵکو لەدنیای غەیری ماددیشدا چەند دروست کراوێکی تر هەیە کە ئێمە بەچاوی سنووورداری خۆمان نایان بینین ، کەئەمەش بەرپەچێکی گەورەیە بۆ ئەو کەسانەی کەتەنها ماددیانە بیر دەکەنەوە و ئەوەی بەهەستەوەرەکان هەستی پێ نەکەن دەڵێن بونی نیە.

٤) باس کردنی إبلیس وڕیگا و کارەکانی ئەوەمان فێردەکات کە خۆمانی لێ بەدوور بگرین و بەردەوام لەسەنگەری دژایەتیدا بین لەبەردەمیدا.

٥) هەردەم پەنادانی مرۆڤەکان بۆ ئامۆژگاریەکانی زاتیپەروەردگارو بەگوێ کردنی مایەی سەربەرزی مرۆڤەکانە، وەدوورکەوتنەوە وبێ گوێ کردنیان بۆ ئەم ئامۆژگاریانە، هۆی بێ نرخ بوونیانە.

٦) تاوانباری تنۆکێکی ڕەشە، لەچاو بەزەیی پەروەردگاردا هەروەك دڵۆپە بارانێك لەدەریایەکی بێ ئەندازەدا کەواتە مرۆڤەکان هەرچەندە تاوان بارین پێویستە ساتێك زوتر

بەدەریای بەزەیی خۆیـان لەپیسـی تاوانـەکانپاك بکەنـەوە چونکـە پـەروەردگار بەخشـندەی تاوانەکانە .

٧) هەموو خاوەن دارێك پێویستی بە گوێ ڕایەڵی کـردن هەیـە ، هـەموو گـوێ ڕایەڵیـەك ڕەوشـت دروسـتی دەکـات ، هـەموو ڕەوشـتێکیش ، بـاوەڕ دروسـتی دەکـات ، هـەموو باوەڕێکیش سەرچاوەکەی بەدی هێنەری بونەوەرە.

٨) خۆ بەگەورەگرتن وەك دار گەنمێکی ناوبۆشە کە هەردەم سـەری بـۆ ئاسمانـە بـەڵام ناخی بێ سوودە ، خۆ بەکەم گرتنیش دار گەنمێکی ناو پڕە کەهـەردەم سـەری دانـەواندوەو ناخیشی سوود بەخشە.

بەپشتیوانی خوای گەورە ژیانی پێغەمبەر ئادەم (علیه السلام) تەواو بوو
چاوەڕوانی ژیانی نوح پێغەمبەر بن بەم زووانە دەکەوێتە بەردەستی خوێنەران

﴿وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه اجمعين﴾

والحمد لله رب العالمين

# سەرچاوەکان


(١) القرآن الكريم

(٢) صحيح البخارى ........................ ألأمام بخارى

(٣)صحيح مسلم ........................ .الأمام مسلم

(٤)تفسير القرآ ن العظيم ........ ألحافظ أبن كثير

(٥)تفسير فى ضلال القرآن ........... .سيد قطب

(٦)تفسير الكبير ...................... فخرالدين الرازى

(٧) تفسير المقتطف ........................ مصطفى خرمدل

(٨)مفردات الفاظ القرآن ............ العلامة راغب أصفهانى

(٩)قصص الأنبياء .................. الحافظ إبن كثير

(١٠) مع الانبياءفي القرآن.............. عفيف عبد الفتاح طبارة

(١١) قصص الأنبياء .................. عبد الوهاب النجار

(١٢) أنه الحق......................... عبد المجيد الزندانى

(١٣) عالم الجن والشياطين .............. د/ عمر سليمان الأشقر

(١٤) مجموعة فتاوى الكبرى............ شيخ الأسلام أبن تيمية

(١٥)الوابل الصيب.......................... إبن القيم الجوزي

(١٦) إغاثة اللهفان.......................... إبن القيم الجوزى

(١٧) كيف نكتب التأريخ ............... محمد قطب

(١٨) منهج التربية الأسلامية.......... محمد قطب

(١٩)حقيقة الشيطان بالمنظور القرآنى .............. شاكر عبد الجبار

(٢٠)عالم الملائكة الأبرار ................ د/عمر سليمان الأشقر

# لەم کتێبەدا

✿ سەرەتایەکی زانستی دەربارەی چۆنیەتی درووست بوونی زەوی و ئاسمانەکان .

✿ بەندی یەکەمی دەدوێ دەربارەی ویستی خوای گەورە بۆ درووست کردنی ئادەم و کاری جێ نشینی.

✿ بەندی دووەمی ئاماژە بۆ جێگیر بوونی ئادەم و حەوا دەکات لەناو بەهەشت داو پاشان ئاگادارکردنەوەیان لەشەیتان و چوونە دەرەوەیان لەبەهەشت.

✿ بەندی سێیەمی دەدوێ لەباسی دوو کورەکەی ئادەم ، کەناسراوون بە( قابیل و هابیل ) و چۆنیەتی ڕژانی یەکەم دڵۆپە خوێن لەسەر زەویدا.

✿ بەندی چوارەمی باسی حیکمەت لەدرووست بوونی شەیتان دەکات .

✿ بەندی پێنجەمی باس لەو ڕێگایانە دەکات کەشەیتان دەیانگرێتە بەر بۆ گومراکردنی بەندەکان .

✿ بەندی شەشەم باس لەتایبە تمەندیەکانی شەیتان دەکات.

✿ بەندی حەوتەم باس لەئامۆژگاری خوای گەورە دەکات بۆ بەندەکانی لەبەرامبەر شەیتان دا .

✿ کۆتا بەندی ئەم چیرۆکە دەدوێ لەچەند وتەو ئامۆگاریەکی گرنگ بۆ خوێنەری خۆشەویست کە لەسەرجەم ڕووداوەکانی ئەم کتێبە وەرگیراوە .

لەبڵاوکراوەکانی کتێبخانەی تیشک

ژمارەی سپاردن ( ١٤٣ ) ١٩٩٨/